بڵاوکراوەی خانەی چاپ و بڵاوکردنەوەی چوارچرا

زنجیرەی (٢١٨)

ناونیشان / سلێمانی ـ سەرەتای شەقامی مەولەولەوی ـ بەرامبەر پاڵاس

مۆبایل ئاسیا ٠٧٧٠١٥٧٥٠٦٧ ـ سانا ٠٧٥٠١١٢٨٣٨٨

نرخی (٢٠٠٠) دینارە

[illegible] کاریکردم

# کێ پەنیرەکەی دەسکاریکردم

نووسینی: .ئیسپنسر جانسۆن

وەرگێڕانی: جەمال حاجی

چاپی یەکەم

٢٠٠٩

## پێناسی کتێب

ناوی کتێب: کێ پەنیەکەی دەسکاریکردم

نووسینی: ئیسپنسر جانسۆن

بابەت:دەروونناسی

وەرگێڕانی: جەمال حاجی

تایپ: وەرگێڕ

نۆبەتی چاپ: چاپی یەکەم ٢٠٠٩

چاپ: چاپخانەی چوارچرا

تیراژ: ١٠٠٠دانە

ژمارەی سپاردنی (١٧٧٦) ساڵی ٢٠٠٩

## پێشەکی :

ئەم چیرۆکە لە نوسینی نوسەری ئەمریکی ((ئیسپنسیر جان سون))ە کەیەکێك بووە لەپڕ فرۆشترین کتێبەکانی ئەو ((لەساڵی ۲۰۰٦)) وەرگێردراوە بۆ زۆربەی زمانە جیهانیەکان..لەوانەش.. فارسی و عەرەبی.. جمالی حاجی لە فارسیەوە وەریگێڕاوەتە سەر زمانی کوردی

تایبەتمەندی چیرۆکەکە زیاتر لە دووخاڵدا... کۆ دەبێتەوە

یەکەم:شێوازی نوسینەکە..شێوازێکی سادەو ساکارە و..ڕستەکان ڕستەی ئاسایین..بەلاّم لەپشت ڕستەکانەوە..دنیا بینیەك هەیە کە پڕ کراوەتەوە لە ئایدیا جۆراوجۆرەکان..کە دواجار خەسڵەتەکانی مرۆڤە جیاوازەکان دیاری دەکات

دووەم:کورتی چیرۆکەکە.. تایبەندمەندیەکی ترە..کەئەویش پێکدێتەوە لە هەلو مەرجی بابەتی خودی مرۆڤەکانی ئەم سەردەمە لەبەر سەرقاڵکردنیان بە ژیانەوە..کەمتر..مەیلی خوێندنەوەیان هەیە.. هەر بۆیە ئەم چیرۆکە لە ماوەیەکی کورتدا دەخوێنرێتەوە خوێنەریش دەخاتە بەردەم چەند ئیختیارێکەوە.. کە لەکۆتای چیرۆکەکەدا گفتو گۆکان باشتر ئاماژە..بە مامەڵەکردن بەو ئیختیارانە دەدات....

هێڵی چیرۆکەکە..ئاماژەیە بە گەڕان بە شوێن ئامانجەکاندا بەتایبەت ئەو چرکەساتانەی..ئامانجەکان..دەکەونە دوورە دەستی و بە ئاسانی ناتوانری کۆنترۆڵ بکری...لەلایەکی ترەوە..ئامانج و هیواکان هاوکێشەی نەگۆڕ نین..بەڵکوو گریمانەی ئەوە دەکری لەکاتی ڕێکدا بگۆڕدری..هەربۆیە..ئەم گۆڕانەیە کە بینای ناوەکی کەسانەکان دیاری

دەكات بەوەی، ئایا ئەم ئینسانە دەتوانیٛ لەگەڵ ئەم گۆڕنەدا ئەمیش ئەقڵیەتی بگۆڕیٛ و بتوانیٛ دەستەوەستان نەوەستیٛ؟ یاخود لەگەڵ گۆڕندا ئەم توشی شۆك دەبیٛ و دەڕوخیٛ..كەئەم پسیارانە.. لەچیرۆكەكەدا.. لەكەسایەتی پاڵەوانەكاندا بەرجەستە بووە.. هم و ها (ئسنیف)و (ئسكری)..

هەڵبژاردەی (ئیسنف)و(ئسكری) لەشێوەی مشك ڕەهەندێكی زانستی هەیە چونكە زۆربەی تاقیكرنەوەكان..لەسەر..مشك دەكری بۆ ئاشنابون بە ئەزمونەكان. كە پەیوەندی زانستیانەی لەگەڵ مرۆڤدا هەیە...

گەڕان و چۆك دانەنان... خۆی لەخۆیدا سەركەوتنی خودە. چونكە تەسلیم بون ڕتدەكاتەوە. نەفی ئەمری واقع دەكات.. ئالەم كاتەدایە كە مرۆڤ. هەست بەبوونی فعلی خۆی زیاتر دەكات و باشتر بریار دەدات و ئازادانەتر هەڵسوكەوت دەكات.. سەركەوتنیش لەچیرۆكەكەدا واتە گەیشتن بە" پەنیر" ئەمەش ئەو چركە ساتانەیە كەهەست بەئازادی دەكرێت.. چونكە لەكاتی سەركەوتندا.. سنورەكانی ترس و (خودی ترسیش) سیحرەكانی بەتاڵ دەكرێتەوە..

مرۆڤ.. مرۆڤایەتی لە دەست ئەدات كە ئامانجێكی روون و ئاشكرای نەبیٛ.. هەمیشە(ڕاڕایە، ترسنوكە.. بەگۆمانە.) دواجار تۆویی لە ناو چوونی خوی لەناخی خویدا دەچێنی وەك (هم)..

گەڕان بەشوێن ژیاندا.. واتە بەردەوام كردنی خودی ژیان و بەرز ڕاگرتنیەتی.. گۆڕان.. خو ئامادە كردنەو گۆنجاندنە لە گەڵ هەلومەرجێكی هەنووكەیی دا.. بەجیٛ هێشتنی رابردوویەك.. كەئەو رابردووە زۆر ...

---

٦ كیٛ پەنیرەكەی دەسكاریكردم

وەك یادەوەرییەك دێتەوە.. (ها) پێكەنینی بەو كاتانە دێت كە گۆزەراوە لە كاتی نەمانی پەنیرەكەی و ئەم تووشی شۆك و سەرسوورمان بووە.. بەوەی پەنیرەكە چی بەسەر هات؟! راستە یەكەم هەنگاو، هەنگاوێكی گران و پڕ مەترسیە.. بەڵام دواجار دەبێتە بەردەباز بۆ ئەوانیتر.

" تصور" كردن و خو ڕاهێنان لەسەر ئەوەی كەهەیە باشترنیە. ئەمە هەڵەیەكی ژیارییە.. لەچیرۆكەكەدا... چونكە میكانیزمی گەڕان و پێداویستیەكانی ژیان ئەگۆڕێت بەحوكمی گۆڕانكاریەكانی چوار دەور...

بەڵام ئەوەی ڕێگرە لەپراكتیزە كردنی گۆڕانكاری.. (ترسە) كەئەمیش وەهمێكی دروست كراو و شتێكی دینیە... ترس كاتێك خوی بەیان دەكات كەچاوەڕوان نەكرێت گۆڕان ڕوو بدات، واتە كاتێك گۆڕانێك لەحاڵەتەكاندا ڕوو دەدات ئەم تووشی (شۆك) دەبێت.. پەرچە كرداری ئاڵۆزێك دەنوێنی وەك (هم) لەراستیدا كاتێك بارودۆخ دەگۆڕی.. كاردانەوەش دەبی بگۆڕدری..واتە پرۆسەی گۆڕان پەیوەندیەكی راستەوانەی لە گەڵ (كائینەكانی) چوار دەوری خویدایە..

لەچیرۆكەكەدا... ئامارە.. بە ئامانجەكان دەكات كەهیوا و ئومێدەكان بە تەنها لە سوچێك و زەمەنێكی دیاری كراودا قەتیس نەبووە.. بەڵكوو لەهەر چركەساتێكدا دەتوانری دەستی بكەێنریت.. پشت بەستوو.. بەدەركێكی زانیاری، بەهەوڵ و ماندوو بوون كەئەمەش سەرەتاكانی چاندنی تۆویی ئیرادەیە.. مرۆڤ.. گەر (دەركێكی مەعریفی) هەبوو پێش ڕوودانی ڕووداوەكان دەرك دەكات و هەستی پێدەكات.. هەر وەك ئەو پەنیرەی كەتەواو بوو لەچیرۆكەكەدا.. دوای تەواو بوون.. بەردەوام بوون دەست

پێدەکاتەوە هەر وەك (نسنیف و نسکری) هەر لەگەڵ زانیان پەنیرەکە نەماوە ئەمان دەستیان کرد بەگەڕان بە شوێن پەنیرێکیتردا.. لەچیرۆکەکەدا.. خەسڵەتی راستەقینەی مرۆڤ ئامارەی پێکراوە ئەویش گەڕانە بە شوێن، بەردەوام بوون بە ژیان لە جوانترین فۆرمدا هەروەها ئامارەیە بە هەست کردن بە ئاسوودەیی هەمیشەیی کە ئەم هەستە هەستێکی هەڵخەڵەتێنەرانەیە.. ئەم هەستەشە وا دەکات (مرۆڤەکان) تووشی شۆك بن کاتێك.. بارودۆخەکە لە پڕێکدا دەگۆڕدری.. ئایدیایەکیتری چیرۆکەکە ئامارەیە لە چۆنیەتی مامەڵە کردن و رووبەروو بوونەوەیە.. ئەویش.. (نسنیف و نسکری) دەبینرێتەوە کە ئەمان بە ئەزموون فێر بوون.. لەگەڵ نەمانی پەنیرەکەدا.. دوو دڵ نەبن و هەمیشە ئامادەیی ئەوەیان تێدایە.. راستەوخو بە بێ بەفیڕو دانی کات بگەرێن بە شوێن پەنیری تردا بەڵام (هم و ها) بەر مەبنای هەندێك بیر کردنەوە کار دەکەن.. کە ناتوانن زوو بریار بدەن.. یا خود هەر بریار نادەن..

لە کوتایدا ئەم چیرۆکە لە فورمدا وا دەبینرێ کە ساکارە.. بەڵام لە ناوەروکدا مەغزایەکی پڕ بەهای ژیاری تێدایە..

م. عوسمان عبدالرحمن

## کێ پەنیرەکەی دەست کاری کردم؟

لەم چیروکە دا چوار کەسایەتی خەیالی نیشان دراون مشکەکان : } و مروڤە بچکۆلەکان(هم)و(ها). ئەم چوار کەسایەتیە بۆ دەرخستنی بەشە ساکار ونائارامیەکانی دەروونی ئێمە، بە بێ لە بەرچاو گرتنی تەمەن, رەگەز,نەژاد, نەتەوە ,ئامازە پێ دراوە.

جاری وا هەیە ئیمە رەنگە وەکوو ئسنیف بین و خێرا هەست بە گۆڕانکاریەکان بکەین، یا خۆد وەکوو ئسکوری بە خێرایی کاردانەوەمان هەبێت. جاری وا وەکوو (هم) مان لێ دێت کە بە نکۆڵی کردن لە گۆڕانکیەکان, بەرەنگاریان لی ئەکات. لە بەر ئەوەی ئەترسێ رووبەرووی شتێکی خراپتر ببێتەوە, یان وەکوو (ها) کە فێر ئەبێت کاتێك کە بارودۆخ بەرەو لای شتیکی باشتر رێنمایی ئەکات خۆی لە گەڵ ئەو گۆڕآنەدا ئەگۆنجێنێت.

بەسەر هاتێك لە پشت پەردەی ئەم داستانەدا

زۆر خۆم بە خۆشحاڵ دەزانم بە سەر هاتێکتان بۆ بگێرمەوە کە لە پشت داستانی(کێ پەنیرەکەی دەست کاری کردم) هەیە. لە بەر ئەوەی ئەم کتێبە لە حالّی حازردا لە بەر دەست دایە تاکوو هەموومان چێژ لە خۆێندنی وەر بگرین و لە کەڵك وەرگرتنی بۆ هەمووان هاو بەش بین.

ئەم داستانە زۆر پێشتر لەوەی کە کتێبی (بەرێەۆبەری یەك خۆلەکی) مان لە گەڵ ئسپێنسێر جانسون نوسی، لە زمانی ئەوەو بیستم و چاوەڕوانی چاپی بووم، ئەو داستانەم زۆر بە لاوە قەشەنگ بوو و ئەمزانی چەند ئەتوانێ سودمەند بێت.

((کێ پەنیرەکەی دەست کاری کردم؟)) داستانیکە سەبارەت بە گۆڕانێك کە لە هەزار کۆنوکەلەبەر روو ئەدات، لەم هەزار کۆنوکەلەبەرە دا چوار کەسایەتی سەرەنج راکێش بە دوای ئەم پەنیرەدا دەگەڕین. پەنیر خۆازتنیکە بۆ ئەو شتانەی کە لە ژیان دا ئەمانەوەێ جا ئەگەر ئیش بێت یان پەیوەندی، پارە و پول، میرە ماڵ، ئازادیی، سەلامەتی،زانیاری، ئارامی دەرونی، یان تەنانەت چالاکی وەرزشی وەکوو راکردن یان وەرزشی گۆڵف.

هەر کام لە ئێمە سەبارەت بە پەنیرەکەمان روانگەی خۆمان هەیە و بە دوایێ دا هەوڵ ئەدەین. لە بەر ئەوەی لەو باوەڕەداین کە ئەگەر بە دەستی بێنین دڵ ئارام ئەبین.زۆربەمان هۆگری بوین و ئەگەر لە دەستی بدەین یان خۆد ئەگەر لێمان وەر بگیرێت، توشی گرفتی دەرونی ئەبین.

((هەزلر کۆنوکەلەبەر)) لەم داستانەدا پیشاندەری شوێنێکە. کە ئێوە بۆ گەیشتن بە ئامانجەکانتان کاتی تێدا بە سەر ئەبەن : ئەمە ئەکرێ رێکخراوێك بێت کە لەوێ ئیش دەکەن، کۆمەڵگایەك بێت کە تێدا دەژین، یان پەیوەندیەکانتان کە لە ژیان دا لە گەڵ خەڵك هەتانە.

من زۆر جار داستانی" پەنیر م" کە ئیستا ئێوە دەستتان داوەتە خۆیندنەوەی لە هەموو جیهان لە لێدوانەکانمدا گێڕاوەتەوە و زۆر جار لە خەڵکم بیستوە کە چ کاریگەریەکی لە ژیانیاندا دا ناوە. حەز ئەکەن بڕوا بکەن یان نە، بەڵام ئەم داستانە کورتە تاکوو ئیستا زۆر کاریگەری هەبووە لە سەر رزگار کردن لە ئیشدا، هاوسەرگیری و کێشەکانی ژیان.

یەکێك لەو نمونە راستانەی سەبارەتەبە بێژەری تەلەفیزیونی بی.بی.سی

[1] کێ پەنیرەکەی دەسکاریکردم

(چارلی جونز)، ئەو ڕاێگەیاند کە بیستنی داستانی (کیّ پەنیرەکەی دەستکاری کردم؟) بوەتە هۆی لە دەست نەچوونی ئیشەکەی. چارلی بێژەرێکی زۆر بە ناوبانگە، بەڵام ئەو بنەچەیەی کە فێری بوو زۆر بە کەڵکی هەموان دێت.ئەمەبە سەر هاتەکەیە: چارلی لە کێبڕکێکانی ئولەمپیك زۆر بە باشی توانی هەواڵەکانی ڕا کردنی"ماراسون" بڵاو بکاتەوە. لە ئەنجامدا کاتێك کە لێپرسراوەکەی وتی ئەویان لە بەشی هەواڵنێری ڕاکردن لا بردووە و بۆ هەواڵنێری لە ئۆلەمپیکی داهاتوودا بۆ بەشی هەواڵنێری مەلە دانراوە زۆر نارەحەت و دلگران بوو، و لە بەر ئەوەی شارەزایی زۆری لەم یاریە نەبوو نا ئۆمید بوو، هەستی ئەکرد ڕێز لە ئیشەکەی نەگیراوە هەر بۆیە تورە بوو، ئەیّ وت : هەستم ئەکرد ئەم کارە پێشێلکاریە و ئەم تورە بوونەی هێواش هێواش لە سەر هەموو کارەکانی کاریگەری بە جیّ ئەهێشت, دواتر، ئەو ناوبانگی داستانی (کیّ پەنیرەکەی دەستکاری کردم؟) ی بیست.

ئەیوت دوای خوێندنەوەی،پێکەنینی بە خۆی دەهات و شێوازی بیر کردنەوە و شێوازی خۆی لە بەرەنگار بوونەوەی لە گەلّ ئەم بابەتە گۆڕی. ئەو زانی کە لێپرسراوەکەی تەنها "پەنیرەکەی دەستکاری کردووە" واتە خۆی لە گەلّ ئەم بارودۆخە ڕاهێنا. خۆیّ لە گەلّ یاریە نوێیەکە هەماهەنگ کرد،خۆی فێری وەرزشەکە کرد، و لەم کاتەدا زانی کە ئەنجامی کاری نوێ هەستی گەنج بوونەوەی لا دروست ئەکات.

زۆری نەخایاند کە لێپرسراوەکەی هەستی بە شێوازی بیر کردنەوەی و ئەو هێزە نوێیەی کرد و بە زووترین کات کاری باشتری پیّ ڕاسپارد.

---

لەوەویەدوا سەرکەوتنی باشتری بە دەست هێنا. تا ئەوەی کە بوو بە یەکێك لە بەناوبانگترین هەواڵنێران و لە تەلاری هەواڵنێرانی فتبۆلێن بەشێکیان بۆ تەرخان کرد.

ئەمە تەنها یەك نمونە بوو لەو نموونانەی کە من تا ئیستا لە سەر کاریگەری ئەم داستانە لە ژیان و ئیش و پەیوەندیە سۆزدارەکانی مرۆڤ بیستومە.

من ئەم کتێبەم تا رادەیەك بە کاریگەر ئەزانم کە پێش و بڵاوکردنەوەی، نزیکەی دووسەد نوسخەم دایە ئەو کەسانەی کە لەکۆمپانیاکەی خۆمان ئیشیان ئەکرد, ئەزانن بۆ؟ لە بەر ئەوەی کۆمپانیای بلاریچارد وەکوو هەر کۆمپانیایەکی گەورەیَ دیکە تەنها بیر لە سەرکەوتنی ئیستایَ دەکاتەوە لە بەر ئەوەی ئەیەوێت خۆیَ لە کێبەرکیَ بازاڕدا بهێڵێتەوە.

پەنیری ئێمە بە بەردەوامی دەستکاری ئەکرێت، بە پێچەوانەی رابردووەو کە بە دوای کارمەندی چالاك و وەفادار ئەگەڕاین، ئەمڕۆژە بە دوای کەسانێك دا ئەگەڕێن کە نەرم ونیان و داهێنەر بن.

بە هەر حالَ،هەر وەها کە ئەزانن ژیان لە بارودۆخێکدا کە بەبەردەوامی لە گۆڕاندایە و ئەتوانی پڕبێت لە فشاری دەروونی، مەگەر ئەوەی کە کەسەکان روانگەی خۆیان سەبارەت بە گۆڕانکاری بگۆڕن و بتوانن باشتر فێری ببن.

با بڕۆینەوە سەر داستانی "پەنیرەکە",

دیار بوو کە ئەو کەسانەی بە پێشنیاری من ئەو کتێبەیان خۆێندەوە هێدی هێدی لە هێزە خراپە دەرونیەکان رزگاریان بوو یەك بە یەك لە هەر

بەشێکەو لایان ئەدا بۆ نوسینگەکەم و سپاسیان ئەکردم. ئەیان وت کە کتێبەکە زۆر بۆیان سودمەند بووە و ئەو توانایەی پێ بەخشیون کە ئەو گۆڕانکاریانەی کە لە نێو کۆمپانیا دێتە ئاراوە لە دیدگایەکی نوێیەو سەیری بکەن.

بڕوام پێ بکەن بۆ خوێندنەوەی ئەم داستانە کورتە پێویستان بە کاتی زۆر نیە بەڵام کاریگەریەکی قوڵ لە دەروندا بە جێ ئەهێڵێت.

بەشی یەکەم کۆبونەوەیەکە، چەند هاوڕێیەکی کۆنی قۆتابخانە هەوڵ ئەدەن سەبارەت بە شێوازی بەرەنگاری خۆیان بەرانبەر بە ئەو گۆڕانکاریانەی کە لە ژیانیان دا رووی داوە گفتوگو بکەن.

داستانێك بە ناوی (کێ پەنیرەکەی دەستکاری کردم؟) دوهەمین بەش لە خۆ ئەگرێت، ئەم بەشە ناوەندە یا خۆد دڵی کتێبەکەیە.

لەم کتێبەدا ئێوە ئەبینن کە مشکەکان لە کاتی رووبەرووبونەوە لە گەڵ گۆڕانەکان دا باشتر کاردانەوەیان هەیە, لە بەر ئەوەی ئەوان هەموو شتێك بە ساکاری ئەگرن. لە حاڵێکدا ئەندێشەی توانای مروڤە بچکۆلانەکان و هەستە مرۆڤانەکانیان هەموو شتەکان ئاڵۆز ئەکەن, هۆکاری ئەم شتە زیرەکی مشکەکان نیە. هەمووان دەزانین کە مرۆڤ لە مشك بەتواناترە. بە هەر حاڵ، کاتێك ئێوە ئەو شتانەی کە ئەم چوار کەسایەتیە ئەنجامی ئەدەن ئەبینن ،بۆتان دەر ئەکەوێت کە مشکەکان و مرۆڤە بچکۆلانەکان, بەرجەستە بووی بەشە سادەکان و نائارامیەکانی ناخی ئێمەن و ئەتوانن ببینن کە ئەنجامی کاری ساکار لە کاتی روودانی گۆڕانکاریەکان تا چ رادەیەك کاریگەری هەیە.

بەشی سێیەم پەیوەندی بە بابەتێکەو هەیە. سەبارەت بەو شتەی کە لەم داستانەدا فیری بوون و ئەوەی کە چۆن ئەم شتانە لە ژیانیاندا بە کار بێنن، هەندێك لە خۆینەرانی ئەم کتێبە تەنها بەشی سەرەکی کتێبەکەیان خۆێندەوە و نەچوونە بەشی توێژینەوەکەو,

بەلام هەندێکی دیکەی خۆینەران لە خۆێندنەوەی (تۆیژینەوەکە) چێژ ئەبینن, لە بەر ئەوەی ئەم بەشە ئەندێشەی ئەوان سەبارەت بە ئەوەی کە چۆن ئەتوانن ئەو شتانەی کە فێری بوون لە ژیانی خۆیان دا بەکار بێنن،بەگەڕیان بکات.

بە هەر حالّ هیوادارم کە ئێوەش وەکو من دوای هەر جارخۆێندنەوەی کتێبەکە خالّێکی نوی و بە کەڵك لە نێویدا بدۆزنەوە و ئەم کارە یارمەتیدەری ئێوە بێت تا گۆرانکاریەکان بە سەر کەوتویی بە رێ بکەن,(ئەگەر سەرکەوتنەکە لە هەر شتێکدا بێت),

هیوادارم ئیوە لەو شتەی کە بە دەستی ئەهێنن چێژ ببینن و لە بیری نەکەن کە"لە گەلّ پەنیرەکە جیبەجی بن"

ەن بلانچارد سانديەگو

١

١٩٩٨

## كۆبونەوە لە شیكاگۆ

لە یەكشەمەیێكی هەتاوی دا چەند هاوڕێیێ كۆنی قۆتابی كە شەوی پێشتر لە كۆبونەوەیەك لە دواناوەندیە كۆنەكەیاندا بەشدار بوون،بۆ نان خۆاردن لە شیكاگۆ كۆ ببونەوە ئەوان هەموو حەزیان ئەكرد لە بەسەرهاتەكانی ژیانی یەكتر ئاگادار بن,

دوای گاڵتەو پێكەنین و خۆاردنی نانێكی چاك دەستیان كرد بە وتووێژ,

ئانجێلا كە یەكێك لە قوتابیە خوشەویستەكان بوو وتی:

" ژیان" لە گەڵ ئەو شتەی كە لە قوتابخانە بیرم لێ ئەكردەوە و گەلێك شت كە لەگەڵ ئەوەی ئیمە دامان نابوو جیاوازی هەیە.

ناتان دانی بە وتەكەی ئەودا ناو وتی: بە.دڵنیاییەوە وایە,

هەمویان ئەیانزانی كە ناتان هەر ئەو ئیشەی كە خیزانەكەی هەیانە گرتویەتیە بەر, ئیش و كارێك كە ماوەیەكی دوور و درێژ بە یەك شیوە بەڕێوە ئەچوو و تا ئەو جێگەی كە ئەمان لە یادیان بوو بە بەشیك لە ئیشەكانی نێیو كۆمەڵگا هەژمار ئەكرێت. هەر بۆیە لەم شێوازی نیگەرانی دەربڕینە سەرسام بوون.

ئەو پرسیاری كرد:

سەرەنجی ئەوەتان داوە كە ئێمە هیچ كات نامانەوێ لە گەڵ گۆڕانی بارودۆخ بگۆڕدرێین؟

كارلۆس وتی : من پێم وایە كە ئێمە لەو ڕووەوە لەبەرانبەر گۆڕاندا!

بەرهەڵەستی ئەكەین كە لە گۆڕان ئەترسین.

جێسیكا وتی:

لە كاپتنێكی تیپی فوتبۆڵێن ناوەشێتەوە كە باسی ترس بكات، من هەرگیز بیرم لەوە نەدەكردەوە كە ڕۆژێ لە ڕۆژان باسی ترس لە تۆ ببیستم.

ئەوان كاتێك زانیان هاوكات لە گەڵ ئەوەی كە هەر كەسەو ڕێگایەكی بۆ ژیان هەڵبژاردووە (لە كەیبانوو تا بەڕێوەبەری كۆمپانیا) بەڵام هەموویان تاقیكردنەوەیەكی وەك یەكیان ئەزمون كردووە. هەموو پێكەنین.

هەموو هەوڵیان دابوو خۆیان لە گەڵ گۆڕانكاریەكانی ژیاندا ڕا بهێنن كە لەم ساڵانەی دوایی دا هاتبووە سەر ڕێگەیان.زۆربەیان دان بەوە دا دەنێن كە ڕێگەیەكی باشیان پێ نەبووە بۆ چارەسەر و ڕووبەڕوو بوونەوە لە گەڵ گۆڕانكاریەكاندا.

دوابەدوا مایكڵ وتی:

من پێشتر لە گۆڕان ئەترسام،كاتێك كە گۆڕانێكی گەورە لە ئیش و كارم دا ڕووی ئەدا، ئەمان ئەزانی ئەبێ چی بكەین ؟ هەر بۆیە كارێكی تایبەتمان نەكرد بە لای كەمەوە هەموو شتێكمان لە دەست چوو.

هەر وەها وتی :

تا ئەو كاتەی كورتە چیرۆكێكی كۆمێدیم بیست كە هەمو شتێكی گۆڕی.

ناتان پرسی:

چۆن؟

– ئێ.. ئەم داستانە دیدگای منی سەبارەت بە گۆڕانكاری بە تەواوەتی

گۆڕی. لەوەو بەدوا گۆڕان بۆ من نەك تەنها بە واتای لە دەست دان نەبوو بەڵكوو تەنانەت بە واتای بە دەست هێنانی شتێكی نوێش حسابم بۆ ئەكرد. ئەم داستانە كار و بارەكەی بۆ روون كردمەو و بە دوای دا بە خێرایی هەموو شتێك چ لە رووی ئیش چ و لە رووی ژیانی خۆم ئاڵوگۆڕی بە سەر دا هات, لە سەرەتاوە ساكاری لە رادە بەدەری كتێبەكە بووە هۆی ئەوەی گاڵتەم پێ ئەهات چونكە وەكوو چیرۆكەكانی دەورەی سەرەتایی بوو، بەڵام دواتر پێكەنینم بە خۆم ئەهات. لە بەر ئەوەی بە روونی و ئاشكرا لە بابەتەكە تێ نەگەیشتبووم و ئەو شتەی كە لە كاتی هاتنی گۆڕانكاریەكان دا كاریگەر بوون ئەنجامم نەدا بوو.

كاتێك پێم زانی چوار كەسایەتی ئەم داستانە وەكوو گرفتەكانی ناخی خۆمە، بیرم كردەوە كە باشتر وایە كە لە جیاتی كامیان رەفتار بكەم و گۆڕانكاریم لە خۆمدا دروست بكەم.

دۆاتر كتێبەكەم بە كەسانی دیكەیّ نێو كۆمپانیا دا, دەستاودەست گەڕا، لە ماوەیەكی كەم دا ئیشەكەمان بەرەو باشە ڕۆی.هەر بۆیە خۆمان باشتر بۆ گۆڕان ئامادە كرد. هەندێكیان وتیان كە ئەم داستانە زۆر یارمەتیدەریان بووە لە نێو ژیانی خێزانیاندا.

چەند كەسێكیش ڕایان گەیاند كە لەم داستانە هیچ كەڵكیان وەر نەگرتووە. هەندێكیان وا بیریان ئەكردەوە كە ئەو شتانەی لەم كتێبەدا هاتووە خۆیان پێشتر ئەیانزانی و هەندێكیش وا بیریان ئەكردەوە كە لەو كاتەشدا بە پێی خاڵە باشەكانی ئەو كتێبە ژیان بە رێوە ئەبەن و

هەڵسووکەوت ئەکەن و پێویستیان بە فێر بوون نیە. ئەوان نەیان ئەزانی کە ئەم کتێبە لە بەر چی بۆ کەسانی دیکە ئەوەندە باشە. جارێکیان یەکێك لە بەرێوبەرە پایە بەرزەکان کە زۆر کەلە رەق بوو وتی: ئەم کتێبە تەنها کات بە فیرۆ ئەدات هەر بۆیە ئەوانی دیکە سەریان ئەکردە سەری و ئەویان بە یەکێك لە کەسایەتیەکانی نێو کتێبەکە ئەناساند.

(مەبەستیان ئەو کەسەی بوو کە فێری هیچ شتێکی نۆی نەبوو و گۆڕانکاری تیایدا رووی نەدا).

ئانجێلا پرسی:

باشە ئەم داستانە چیە؟

مایکل وتی:

ناوی ئەمەیە (کێ پەنیرەکەی دەستکاری کردم؟)

هەموو پیێ کەنین.

ئانجێلا وتی:

من هەر لە ئێستاوە حەزم لێەتی.

کارلۆس وتی:

ئەتوانی داستانەکەمان بۆ بگێریتەو لەوانەیە ئێمەش شتێك فێر بین.

مایکل وەلامی دایەوە :

بە دڵنیایەوە، زۆرم پێی خۆشە، زوریش ناخاینی. و بەم شێوەیە دەستی پیێ کرد:

## " کێ پەنیرەکەی دەستکاری کردم؟"

رۆژی لە رۆژان لە دەڤەرێکی دوور دەست چوار کەسایەتی بچکۆلە ژیانیان

---

۱۸ کێ پەنیرەکەی دەسکاریکردم

به سەر ئەبرد هەمویان لە نێو شوینیکی هەزار کۆن و کەلەبەری دا بە دۆای پەنیرێکی بە تامدا کە بیخۆن لەم کۆن بۆ ئەو کۆن هەر لە ڕاکەڕاکدا بوون.

دوانیان دوو مشك بوون بە ناوەکانی (ئستیف) و(ئسکری) و ئەو دوانەی دیکە کە دوو مرۆڤی بچکۆلە بوون بە ناوەکانی (هم)و(ها) کە جەستەیان بە قەدەر مشکیك بوو بەڵام دەموچاو و رەفتاریان زۆر لە مرۆڤی مۆدیرن و ئاسایی ئەچوو. کارەکانی ئەوان لە بەر ئەوەی کە ئەندازەیان بچووك بوو زۆر بە ئاسایی وەر ئەگیرا، بەڵام ئەگەر بە وردی سەرەنجیان ئەدرا چەندەها شتی سەرسوور هێنەر بە دی ئەکرا!

هەموو رۆژێك مشکەکان و مرۆڤە بچکۆلەکان کاتی خۆیان بە گەڕان بە نیۆ ئەو کۆنو کەلەبەرانە بە فیرۆ ئەدا و بە دوای ئەو پەنیرەی کە حەزیان لیّ بوو ئەگەڕان.

مشکەکان، ئستیف و ئسکری تەنها دوو مشکی سادە بوون بەڵام رەوشتی خۆرسکیان بە باشی کاری ئەکرد ئەوان هەر وەکوو جاران بە بەردەوامی بە دۆای پەنیری تورت و تام خۆش ئەگەڕان.

مرۆڤە بچکۆلانەکان واتە (هم)و(ها) لەمێشکیان کە پڕ لە هەست و بۆچونی جۆراوجۆربوو، بۆ بەدەست هێنانی پەنیری تایبەت و بیّ وێنە کە لەو باوەڕادا بوون کە ئەوان خۆشحاڵ و کامەران ئەکات، کەڵکیان وەر ئەگرت.

هەر چواریان سەرەڕای جیاوازی زۆریان پێکەوە، خاڵیکی هاوپێچیان هەبوو : هەموویان هەموو رۆژێك جلی وەرزشیان لە بەر ئەکرد، کالەیان لە پیّ ئەکرد و ماڵیان بە جیّ ئەهێشت و خێرا بە دۆای ئەو پەنیرەی حەزیان

لێ بوو خۆیان ئەکرد بە هەزار کۆن و کەلەبەر دا،

شۆێنەکە ژووراو ژوور و ڕاڕەویکی پێچاوپێچی لە خۆ گرتبوو کە لە هەندێك لەم شۆینانە پەنیری بە تام ئەدۆزرایەوە, بەڵام چەندین سوچی تاریك و داخراویشی هەبوو کە ری تیێ ئەچوو ون ببن، ئەو شۆینە بۆ ئەوانەی کە ڕێگاکەیان ئەدۆزیەو پڕ بوو لە نەهێنی کە ئەبووە هۆی ئەوەی کە زۆرتر چێژ لە ژیان ببینن. مشکەکان ئسنیف و ئسکری بۆ دۆزینەوەی پەنیر لە ڕێگای سادەی تاقیکردنەو و هەڵە کەڵکیان وەر ئەگرت.

ئەوان ئەچوونە ڕاڕەوێکەو و ئەگەر هیچیان دەست نەکەوتای ئەگەڕانەوە و ئەچوونە ڕاڕەوێکی دیکەو. ڕاڕەو بەتاڵەکانیان لە بیر نەدەکرد و خێرا ئەچوون بۆ شۆینە نوێیەکان.

ئسنیف بە لوتی گەورەیەو بۆنی ئەکرد و شۆینی پەنیرەکەی ئەدۆزیەوە و ئسکری خێرا خۆی پیێ ئەگەیاند. بەڵام جاری وا هەبوو ون ئەبوون بەرەو لایەك بە هەڵە ئەرۆیشتن و خۆیان ئەکێشا بە دیوارەکاندا. و پاش ماوەیەك دووبارە ڕێگاکی خۆیان ئەدۆزیەو.

مروڤە بچکۆلانەکان (هم)و(ها) لە ڕێگایەکی جیاواز کەڵکیان وەر ئەگرت کە بە پێی هێزی بیر کردنەوە و فێر بوون و تاقیکردنەوە دایان رشتبوو, بەڵام جاری وا هەبوو سەرکەوتوو ئەبوون و جاری واش هەبوو کە سۆز و بۆچوون بە سەریان دا زاڵ ئەبوو و گێژی ئەکردن.هەر بۆیە ژیانی لەو شۆینە بۆ نالەبار کردبوون.

لە کۆتاییدا ئسنیف و ئسکری، (هم)و(ها) هەر کەو بە شێۆازی خۆیان ئەو شتەی کە بە دۆای دا دەگەڕان بە دەستیان ئەهێنا.

---

٢٠ کیێ پەنیرەکەی دەسکاریکردم

ڕۆژێکیان هەمویان لە کۆتایی یەکێك لە ڕاڕەوەکان لە وێستگەی "پ" ئەو پەنیرەی مەبەستیان بینیەوە، دوای ئەوە هەموو ڕۆژێك بەیانی مشکەکان و مرۆڤە بچکۆلانەکان جلە وەرزشیەکانیان لە بەر ئەکرد و خۆیان ئەگەیاندە وێستگەی "پەنیر".

زۆری نەخایاند کە هەر یەکەو بەرنامەیەکی ڕۆژانەیان بۆ خۆیان دانا. نستیف و نسکری هەموو ڕۆژێك بەیانی زوو لە خەو هەڵ دەسان و ڕێگای هەمیشەیی خۆیان لە نێو هەزار کۆن و کەلەبەرەکە ئەگرتە بەر.

ئەوان هەرکە ئەگەشتنە سەر شۆێنەکە کالەکانیان دا ئەنا و پێکەوە گرێیان ئەدا و ئەیان خستە دەور ملیان لە بەر ئەوەی بۆ کاتی پێویست بە خێرایی دەستیان پێ بگات، ئینجا بە لەزەتەو دەستیان ئەکرد بە خواردنی پەنیرەکە.

لە سەرەتاوە (هم)و(ها) هەموو ڕۆژێك بەیانی بە خێرایی خۆیان ئەگەیاندە وێستگەی پەنیر "پ" تاکو بگەنە ئەو پەنیرە نوێیە بە تامە کە چاوەڕوانیان ئەکرد بیخون.

بەڵام پاش ماوەیەك مرۆڤە بچکۆلانەکان بەرنامەیەکی پێچەوانەیەیان گرتە بەر (هم)و(ها) هەموو ڕۆژێك تۆزێك درەنگتر لە خەو هەڵئەسان. بە هێواشی جلیان لە بەر ئەکرد و بە پیاسە ئەچوون بۆ وێستگەی پەنیر, لە بەر ئەوەی شارەزای شۆێنی پەنیرەکە بوون و ڕێگاکەیان ئەزانیی.

ئەوان بیریان لەوە نەئەکردەو کە پەنیرەکە لە کویەو گەیشتووە یان خود کێ ئەو پەنیرەی لەوێ داناوە، وایان بۆ خویان دانابوو کە پەنیرەکە هەموو کات لەوی دا ئەنرێت.

هەموو رۆژێك بەیانی كە (هم)و(ها) نەگەیشتنە وێستگەی پەنیر شتەكانیان بڵاو نەكردەو چما لەماڵی خۆیان دانیشتوون. جلە وەرزشیەكانیان هەڵنەواسی و كالەكانیان هەڵنەدایە سوچێكەو و نەعلەكانیان لە پێ نەكرد و لەوەی كە پەنیرەكەیان دەست كەوتووە هەستیان بە رەزامەندی و سەركەوتن ئەكرد.

(هم) وتی:

زۆر باشە !

نێرە ئەوەندە پەنیری لێیە كە هەتا ماوین بەشمان ئەكات.

مرۆڤە بچكۆلانەكان هەستیان بە سەركەوتن و كامەرانی ئەكرد و وا هەستیان ئەكرد هەتا هەتایە بۆیان ئەلوێت.

زۆری نەخایاند كە (هم)و(ها) ئەو پەنیرەی كە وێستگەی پەنیر "پ" بەدەستیان هێنابوو بە هی خۆیان ئەزانی.

ئەوەندە پەنیر لەو شۆینە هەبوو كە لە ئەنجامدا وازیان لە ماڵەكەی خۆیان هینا تاكوو بە سەر چاوەی پەنیرەكەو نزیكتر بن و ژیانیكی ئارامتر لە نزیكی پەنیرەكەو بۆ خۆیان پیك بهینن.

(هم)و(ها) هەوڵیان دا بە جۆانكاری لە سەر دیوارەكان بە كیشانی چەند وێنەیەكی پەنیر ونوسینی چەند دروشمیكی دڵخۆشكەر شۆینەكەیان گەرم و گۆڕ بكەن. یەكێك لە دروشمەكان ئەمە بوو

" خۆاردنی پەنیر نێوە خۆشحال دەكات "

جاری وا هەبوو كە (هم)و(ها) بانگهێشتی هاوریەكانیان ئەكرد بۆ وێستگەی پەنیر"پ" تاكوو ئەو پەنیرە گەورەیەیان ببینن و بە شانازی

کردنەوە ئەیانوت: پەنیریکی باشە، وا نیە؟.
جاری واش هەبوو بەشی هاوریەکانیان لی ئەدا بەلاّم جاری واش هەبوو ئەوەیان نادەکرد.
(هم) وتی:
ئەم پەنیرە هی خۆمانە (ئێمە بۆ دۆزینەوەی زۆر زەحمەتمان کێشاوە).
تۆزێك پەنیری هەلگرت و خواردی دوای ئەوە هەر وەکوو جاران خەوی لی کەوت. هەموو شەوێك مرۆڤە بچکۆلانەکان ئەوەندە پەنیریان ئەخوارد کە لارەولار بەرەو مالّ ئەرویشتن. و هەموو بەیانیەك بە دلّنیایەو بۆ خواردنی پەنیر ئەگەرانەوە. ئەم شێوازە ماوەیەکی زۆری خایاند.
پاش ماوەیەك،
دلّنیایی (هم)و(ها) بوو بە لە خۆ بایی بوون. وایان لی هات ئەوەندە هەستی رەزامەندیان هەبوو کە ئاگایان لە رووداوەکانی دەوروبەریان نەما.
ئستیف و ئسکریش هەر وەکوو جاران لە سەر ژیانی ئاسایی خویان بەر دەوام بوون. هەموو رۆژێك بەیانی زوو ئەگەشتن، بۆنیان ئەکرد زەوینیان هەلّئەکەند و بە دەور وێستگەی پەنیردا رایان ئەکرد. دەور و بەریان ئەپشکنی تاکوو بزانن ئایا لە گەلّ رۆژی پیش دا هیچ گۆرانیك رووی داوە یان نە؟ ئینجا بۆ لیقرتاندنی پەنیرەکە لە سەری دائەنیشتن.
رۆژیکیان بەیانی کاتیك گەیشتنە وێستگەی پەنیر "پ"، تی گەیشتن کە ئیدی پەنیرێك لە ئارا دا نیە. ئستیف و ئسکری لە بەر ئەوەی پێشتر هەستیان بەوە کردبوو کە ئازووقەی پەنیرەکە رۆژبە رۆژ روو لە کەمی ئەنێت سەر سام نەبوون. ئەوان خۆیان بۆ ئەم رووداوە ئامادە کردبوو و بە

شیوەی سروشتی نەیانزانی ئەبێ چی بکەن. سەیری یەکتریان کرد، کالەکان کە لە دەور ملیان هەڵواسرا بوو لە پێیان کرد و قەیتانەکانیان بە قایمی بەست.

مشکەکان لە سەر رووداوکە زۆر لیکۆڵینەوە و وردبینیان نەکرد، بۆ ئەوان رووداو و وەڵام هەر دوو سادە بوو, بارودۆخ لە وێستگەی پەنیر گۆڕاوە، واتە ئستیف و ئسکریش بریاریاندا گۆرانکاری لە خۆیان دا بکەن.

هەردووکیان بە وردی سەیری نێو کونوکەلەبەرەکانیان کرد ئینجا ئسنیف لوتی هەڵبڕی، کەوتە بۆن کردن، بە جووڵەی سەر ئسکری تێ گەیاند کە بە دوواییدا ڕا بکات.

هەردووکیان خێرا کەوتنە گەڕان بە دووای پەنیری نوێدا.

هەر لەو رۆژەدا (هم) و(ها) تۆزێك درەنگتر گەیشتنە وێستگەی پەنیر. لەو رووەو کە گۆیان نەئەدایە گۆرانکاریە وردەکان.دڵنیا بوون کە هیشتا پەنیری لیە و ئامادەیی ئەوەیان تیایدا نەبوو کە رووبەرووی ئەو راستیە ببنەوە. (هم) هاواری کرد,

پەنیری لی نیە؟!

بە هاتو هاوارەو وتی:

پەنیرەکە نیە؟

وای ئەزانی لە بەر ئەوە بە دەنگی بەرز هاوار ئەکات کە بەو ئەرەیە پەنیرەکە ئەگەرێتەوە شوینی خۆی.

کێ پەنیرەکەی منی بردووە ؟؟

دەستی خستە سەر کەلەکەی و بە دەموچاوی سوور هەڵگەڕاو و بە

دەنگی بەرز قریشکاندی.

ئەمە ڕەوا نیە.

(ها) بەبیباوەڕیکەو سەری بۆ لەقاند. ئەویش چاوەڕوان بوو کە پەنیرەکە لە وێستگەی "پ" ببینیتەو، تایبەتی حسابی بۆ کردبوو هەر بۆیە لە شوێنی خۆی جوولەی بۆ نەدەکرا, هەرگیز لەو بڕوایەدا نەبوو وەها شتیەك روو بدات. (هم) هیشتا بە هات و هاوارەو ئەبۆڵاند. بەڵام (ها) نەیدەویست بیانبیستێت. حەزی ناکرد ئەو شتەی کە دۆچاری بوون قبولّ بکات هەر بۆیە هەموو شتیکی دایە دەست فەرامۆشی.

ڕەفتاری مرۆڤە بچکۆلانەکان زۆر بە عاقلانە نەبوو، بەڵام شیاو بوو، دۆزینەوەی پەنیر کاریکی سادە و ساکار نەبوو لە راستی دا پەنیر بۆ مرۆڤە بچکۆلانەکان زۆرتر لەوەی کە خۆاردن بیت بۆ تیر کردنی رۆژانەیان، بە مانای گەیشتن بە سەرکەوتوویی و کامەرانی.بوو, ئەوان هەر یەکەو بە پێ سەلیقەی خۆی ڕای تایبەتیان سەبارەت بە پەنیرە کە هەبوو.

بۆ هەندێکیان دۆزینەوەی پەنیر بە مانای هەبووی دەستکەوتنی سامان و سەروەت بوو بۆ هەندێك چێژ بردن بوو لە لەش ساغی جەستەیی و بۆ هەندێك بە مانای گەیشتن بە بەرز بوونەوەی وورە بوو.

بەڵام بۆ (ها) پەنیر تەنها بە مانای ئاسایش، خاوەن خێزانی میهرەبان لە ئایەندە و ژیان لە ماڵێك لە سووچێکی شەقامێك لە پەنیر درووست کرابێت.

بۆ (هم) پەنیر بەو مانایە بوو کەببێت بە مرۆڤێکی گرنگ و چەندین ژێردەستەی لێ درووست بکات و ببێت بە خاوەن کۆشکێکی گەورە لە

سەر تەپۆڵکەیەکی گەورە لە پەنیر. بە هۆی ئەوەی کە پەنیر گرنگیەکی زۆری بۆیان هەبوو. مرۆڤە بچکۆلانەکان کاتێکی زۆریان بە فیڕۆ دا بۆ ئەوەی بڕیار بدەن. تەنها شتێك کە بە ئەندێشەیاندا هات ئەوە بوو کە وێستگە کە بگەڕێن تاکوو بزانن بە راستی پەنیرەکە ون بووە یان نە.

لە هەمان کاتدا ئستیف و ئسکری بە خێرایی دەستیان کرد بە گەڕان، (هم) و (ها) هەر منجە منجیان ئەکرد و بە گلە و گازەندە و هات و هاوارەو سەرقاڵ بوون. (ها) توشی خەفەت و خەمۆکی بوو، ئەیوت ئەگەر بەیانیش پەنیرەکە لەوێ نەبیت چی بکەین؟ ئەو هەموو پلانەکانی داهاتووی خۆی بە پێ ئەو پەنیرە دارشتبوو.

مرۆڤە بچکۆلانەکان بروایان نەدەکرد کە وەها بە سەرهاتێك رووی داوە ؟ نا، کەس ئاگاداری نەکردبوون. ئەمە راست نەبوو. بریار نەبوو بارودۆخەکە وای لێ بێت.

(هم) و (ها) ئەو شەوە برسی و داماو گەڕانەوە ماڵەو . بەڵام پێش ئەوەی ئەو شۆینە بە جێ بهێڵن (ها) لە سەر دیوارەکە نوسیی:

" تا ئەو ڕادەیەی کە پەنیرەکەتان لاوە گرنگ بێت

زۆرتر هەوڵ بۆ پاراستنی ئەدەن"

رۆژی دواتر (هم) و (ها) لە ماڵ دەرچوون و گەڕانەوە بۆ وێستگەی "پ". هیشتا چاوەروان بوون کە هەر چۆنێك بووە پەنیرەکەیان بدۆزنەوە.

بارودۆخ هەر وەك خۆی بوو پەنیرێکی دیکەی لێ نەبوو.

مرۆڤە بچکۆلانەکان نەیاندەزانی ئەبێ چی بکەن. (هم) و (ها) بە بی فزە و جوڵە وەستا بوون.

(ها) چاوی نووقاند و بە هەردوو دەست گوێی خۆی گرت،تەنها ئەیویست پەیوەندی خۆی لە گەڵ دەرەوەی خۆی دا ببڕێت,

نەیدەویست وا بیر کاتەو کە ئازوقەی پەنیر وردە وردە کەم بووەتەوە بەڵکوو لەو بڕوایەدا بوو کە پەنیرەکە لە پڕیکدا نەماوە.

(هم) زۆرتر ڕووداوەکەی شی ئەکردەوە، لە ئەنجامدا مێشکی بە هێز و سیستەمی بڕیار دانی بۆ ماوەیەك لە ئیش کەوت، بە ڕاشکاوی پرسی:

بۆ وایان لێ کردم؟ بە ڕاستی چی لێرە ڕووی داوە ؟.

لە ئەنجامدا چاوی کردەوە، سەێری دەور و بەری کرد و وتی:

بە ڕاست، ئەوە ئستیف و ئسکری لە کوێن؟ بە ڕای تۆ،ئەوان شتیك ئەزانن کە ئێمە لەوە بێ ئاگا بین؟

(هم) بە توانجەو وتی:

ئەوان ئاگایان لە چیە ؟

ئینجا وتی :

ئەوان تەنها دوو مشکی ئاسایین و تەنها بەرانبەر بەو شتەی کە ڕوو ئەدات، کاردانەوەیان هەیە، ئیمە مرۆڤی بچکۆلەین و ئەبێت بتوانین سەر لەم کیشەیە دەر بێنین.

(ها) وتی :

- ئەزانم، بەڵام،لەوە ناچێت بتوانین لەم کاتە دا بە هۆشیاریەوە بڕیار بدەین، بارودۆخی دەور و بەرمان لە گۆڕاندایە، لەوانەیە پێویست بکات کە ئێمەش بگۆڕین و بە شێوازیکی دیکە کار بکەین.

(هم) پرسیاری کرد:

بۆ ئەبێت خۆمان بگۆرین؟ ئیمە مرۆڤی بچکۆلەین، ئیمە شازین،ئەم شتانە نابیت بە سەر ئیمە دا بیت,یا خۆد ئەگەر روو ئەدات ئەبێت لە قازانجی ئێمە کۆتایی پیٚ بیت,

(ها) پرسیاری کرد:

بۆ ئەبێت لە قازانجی ئێمە کۆتایی پیٚ بێت؟

(هم) وەلامی دایەوە :

لە بەر ئەوەی ئێمە مافمان هەیە.

(ها) ئەیویست بزانیت :

ماف سەبارەت بە چی؟!

(هم) وتی :

ئێمە سەبارەت بە پەنیرەکەمان مافمان هەیە.

(ها) پرسیاری کرد:

بۆ؟

(هم) وتی:

لە بەر ئەوەی ئێمە ئەم کێشەیەمان دروست نەکردووە،کەسێکی دیکە ئەم کارەی کردووە و ئێمە ئەبێت بە مافی خۆمان بگەیین.

(ها) پێشنیاری کرد :

لەوانەیە وا باشتر بێت کە واز لەم هەموو شی کردنەوە و هەلسەنگاندنی ئەو شوێنە بێنیین، و بڕوین بە دوای پەنیری نویدا بگەرێین.

(هم) بە نا رەزایەتیەو وتی:

نا، من ئەمەویت چۆنیەتی ئەم رووداوە بدۆزمەوە.

لە حاڵێیکدا کە (هم) و (ها) هێشتا بریاریان ئەدا کە چی بکەن. ئسنیف و ئسکری دەمێك بوو کە بە ری کەوتبوون.

ئەوان بە دوای پەنیر دا لە ناو کۆنوکەلەبەرەکان دا ئەگەڕان و سوچ و گۆشەکانی هەر ناوەندیکی پەنیریان ئەپشکنی.

بیریان لە هیچ شتێکی دیکە جگە لە پەنیری نۆی نەدەکردەو. ماوەیەك هیچ پەنیرێکیان دەست نەکەوت تاکوو لە ئەنجام دا لە بەشێك لە هەزار کۆنوکەلەبەرەکە دا کە پێشتر هەرگیز نەرۆیشتبوون،واتە :

"وێستگەی پەنیری "ن" ".

شادمان لەو شتەی کە دۆزیانەو هاواریان کرد :

ئازوقەیەکی گەورە لە پەنیری نۆی!

بڕوایان نەبوو کە ئەمە راست بێت. لە بەر ئەوەی ئەو شوێنە گەورەترین کۆگەی پەنیر بوو کە تاکوو ئەو کاتە بینیبوویان.

بە درێژایی ئەو ماوەیە (هم) و(ها) هێشتا خەریکی دەست نیشان کردنی شوێن و کارەکانیان لە وێستگەی "پ" بوون.

رەنگ و روی بێ پەنیری پێوە دیار بوو.

ئەوان وردە وردە بێ وورە و تووڕە بوون و یەکتریان لە سەر ئەو بە سەر هاتە تاوانبار ئەکرد.

جاری وا هەبوو کە (ها) بیری لە دۆستانی خۆی، ئستیف و ئسکری ئەکرد کە ئایا ئەوان تا کوو ئیستا پەنیریان دوزیوەتەوە یان نا !

ئەیزانی کە هاوریەکانی بە سەرهاتی زۆر سەختیان بە رێ کردووە، چونکە ڕا کردن بە ناو هەزار کۆنوکەلەبەر دا دڵەڕاوکی و ئەگەر دروست

ئەكات.

بەلآم لە راستى دا ئەيزانى كە ئەم رووداوە ماوەيەكە و زۆر ناخاينيت.

جارى وا (ها) ئەنديشەى وا بوو كە ئستيف و ئسكرى پەنيرێكى نوێيان دوزيوەتەوە و بە لەزەتەو خەريكى خۆاردنن.

بيرى ئەكردەو كە زۆر باش ئەبوو ئەگەر دەستى بكردايە بە گەڕانيكى ئەترسانە بە نێو هەزار كۆنوكەلەبەر دا و پەنيرێكى نۆيى بدۆزيايەتەوە، تەنانەت ئەيتوانى تامى ئەو پەنيرە نۆيە لە سەر زمانى هەست پیٚ بكات.

(ها) هەر چەندە زورتر خوى بە خەيالٚى پەنيرە نۆييەكەو سەر قالٚ ئەكرد زۆرتر تواناى بە جیٚ هێشتنى وێستگە كۆنەكەى پەيدا ئەكرد.

لە پرێكدا هاوارى كرد:

با برۆين

(هم) وەلآمى دايەوە :

نا من حەزم لێرەيە. لێرە هەم ئاسوودەم هەم شارەزام جگە لەوە دەرەو جيگاى مەترسيە

(ها) بەلگەى بۆ هێنايەوە :

نا مەترسى نيە ئێمە پێشتر زۆر جار چوينەتە زۆربەى شۆينەكانى هەزار كۆنو كەلەبەرەوە و دووبارەش ئەتوانين ئەو كارە ئەنجام بدەين.

(هم) وتى:

من بۆ ئەم كارە زۆر پيرم و لەوى كە وون بم و كارێكى شێتانە بكەم ئەترسم، ئەیٚ تۆ؟

بەم قسەيە(ها) ترسى شكست بە سەرى دا زالٚ بوو بۆيە هيواى بۆ

---

بەدەست هینانی پەنیری نۆی لە دەست دا.

بەم چەشنە مرۆڤە بچکۆلانەکان هەموو رۆژێك هەمان کارەکانی پێشتریان ئەنجام ئەدا.

ئەوان هەر ئەچوون بۆ وێستگە پێشووەکە و بە بێ بەدەست هێنانی پەنیر و نیگەران و دڵشکاۆ ئەگەڕانەوە ماڵەو.

ئەوان هەوڵیان ئەدا کە دان بە ئەم رووداوانە ئەنێن بەڵام هەموو رۆژێك خەۆیان زۆرتر لیٚ تیك ئەچوو توانایان روو لە کەمی ئەبوو و وردە وردە توورەتر ئەبوون. ماڵەکانیان وەکوو جاران پڕ رەونەق نەبوو.

مرۆڤە بچکۆلەکان زۆر بە سەختی خەۆیان لی ئەکەوت و لە ترسی ئەوەی کە پەنیریان دەست نەکەویت خەوی ناخوشیان ئەبینی،بەڵام هەموو رۆژێك ئەچوونەو بۆ وێستگەی پێشوو و لەوی چاوەڕوانیان ئەکرد.

(هم) وتی:

ئەزانی! ئەگەر زۆرتر هەولٚ بدەین بۆمان دەردەکەوێت هیچ شتێك نەگۆڕاوە. رەنگە پەنیرەکە هەر لەم نزیکانەدا بێت، لە پشت دیوارێکەو شاردبێتیانەو. رۆژی دۆاتر (هم) و (ها) بە کۆمەڵێك شتەو گەڕانەوە. (هم) قەڵەمێکی گرتبوو و(ها) بە چەکۆش لیٚ ئەدا، تاکوو کۆنیکیان کردە نیۆ دیوارەکەی وێستگەی "پ" لە کۆنەکەو بە وردی سەیری ناوەیان کرد و بەڵام هیچ پەنیرێك دیار نەبوو.

نا ئۆمید بوون بەڵام لەو باوەرەدا بوون کە ئەم کێشەیە چارەسەر ئەکریت.

هەر بۆیە رۆژانە زووتر دەستیان پیٚ ئەکرد زۆرتر ئەمانەوە و زۆرتر

ئیشیان ئەکرد، بەڵام پاش ماوەیەك تەنها شتێك کە هەیانبوو کۆنێکی گەورە بوو لە نێو دیوارەکەدا،

(ها) وردە وردە هەستی بە جیاوازی نێوان هەوڵدانیان و دەستەکەوتەکانیانی کرد

(هم) وتی :

رەنگە تەنها ئەبێت لێرە دانیشین سەیر کەین بزانین چی روو ئەدات، هەر کاتێك بێت هەر ئەبێت ئەو پەنیرە بهێننەوە شوێنی خۆی،

(ها) حەزی ئەکرد بروا بەم شتە بکات، هەر بۆیە هەموو رۆژێك بۆ پشوو ئەگەڕایەوە ماڵەو و بە بێ هیوا لە گەڵ (هم) ئەگەڕایەوە بۆ وێستگەی پێشوو بەڵام هیچ هەواڵێکی پەنیرەکە نەبوو،

مرۆڤە بچکۆلانەکان لە تاو برسیەتی و فشاری دەروونی لاوازتر ئەبوون (ها) هێواش هێواش لەو چاوەڕوانیەی کە تێیدا بوو بۆ باشتر بوونی بارودۆخەکە، ماندوو بوو، هەستی کرد کە ئەگەر لەوە زۆرتر لە دۆخی بێ پەنیری بەردەوام بن، زۆرتر زەرەرمەند ئەبن، هەستی پێ کردبوو کە حەز و ئارزوو لە دەست ئەدەن

لە ئەنجامدا، رۆژێکیان (ها) دەستی بەپێ کەنین کرد و وتی :

سەیری ئێمە کە ! ئێمە هەر خەریکی کارە هەمیشەیەکانین و سەرسامین بۆ چی بار و دۆخەکە باشتر نابێت ئەگەر کارەکە بەم رادەیە شیتانە نەبۆایە تەنانەت زۆرتر جێگەی خەندەو پێ کەنین بوو.

(ها) حەزی لەوە نەبوو جارێکی دیکە بڕواتە نێو هەزار کۆن و کەلەبەرەو چونکە ئەیزانی ون ئەبێت و لەو باوەڕەدا بوو کە پەنیریشیان دەست

ناکەوێت، کاتێك زانی کە ترس بە سەریدا زاڵ بووە، ناچار بوو شیتانە پێبکەنیت، پرسیاری لە (هم) کرد:

- کالەکانمان لە کۆی دا ناوە؟

ماوەیەکی خایاند تاکوو دوزیانەوە. لەبەر ئەوەی لە وێستگەی پێشوودا پەنیریان دەستکەوتبوو ئیتر وایان دانابوو کە پێویستیان پێی نابیت بۆیە فرەیان دابووە لایەکەوە.

کاتیك (هم) بینی هاوریەکەی جلە وەرزشیەکانی لە بەر ئەکات وتی:

- تۆ بە راستی خۆ ناتەوێت بچیتە نێو هەزار کۆنوکەلەبەرەکەوە ؟ وا نیە؟ بۆ لە گەڵ من لێرە نامێنیتەوە تاکوو پەنیرەکە بگەرێننەوە؟

(ها) وتی:

وا بزانم ناتەویّ تێبگەیت، منیش نەمدەویست تێبگەم. بەڵام ئیستا پێم زانیوە کە ئەوان هەرگیز نایانەویّ کە پەنیرەکە بگەرێنەوە. کاتی ئەوە هاتووە کە ئێمە پەنیریکی نۆی بدۆزینەوە.

(هم) بە نارەزایەتیەوە وتی:

بەڵام ئەگەر لە دەرەوەی ئێرە پەنیرێك بوونی نەبێت چی؟ یان ئەگەر هەبێت و تو نەیدوزیتەوە چی؟

(ها) وتی:

نازانم

ئەو زۆر جار ئەو پرسیارەی لە خۆ کردبوو. وە دووبارە هەمان ترسی تووش بوو هینایەوە سەر سفر. لە خۆی پرسی:

- لە کۆی ئەتوانم پەنیر پەیدا بکەم. لێرە یان لە هەزار کۆنوکەلەبەر ؟

ئەو نمایشەی لە مێشکی خۆیدا هێنایە بەر چاو، خۆی لە نێو هەزار کۆنوکەلەبەر دا نەترسانە بینیەوە، لە هەمان کات دا کە ئەم وێنە چاوەڕوان نەکراوانەی لە مێشکدا دروستبوو.

هەم سەرسام بوو هەم هەستیکی باشیشی پەیدا کرد,

خۆی ئەبینی کە لە هەزار کونوکەلەبەردا ون بووە، بەڵام دڵنیا بوو کە لە ئەنجامدا لە دەرەوەی ئەم شوێنە پەنیرێکی نوێ و چەند شتێکی چاکی دیکە کە بە هۆی پەنیرەکەو دەدوزێتەوە بە دەست ئەهێنێت.

هێزی دایە بەر خۆیی و، پاشان لە هێزی بیر کردنەوەی خۆی استفادەی کرد و وینەیەکی بە ئیرادەتری لە خۆی ونیا کرد و واقعبینانەتر وردەکاریەکانی هەڵسەنگاند تاکو لە کاتی پەیدا کردنی پەنیری تازەدا چاکتر تامی لێببینێت هەروەك چون لە کاتی خۆاردنی پەنیری سویسرایی و ئەمەریکی و ئیتالّی، پەنیری.نەرم و بەتامی فەرەنسا لە زمانی ئەبرد.

ئینجا بە بیستنی دەنگی (هم) داچەڵەکی و زانی کە هێشتا لە وێستگە کونەکەی "پ" دان,

(ها) وتی :

- جاری وا هەیە کە بارودۆخ ئەگوڕدرێت و وەکوو سەرەتا نامێنێت وا دیارە کە ئەمە یەکیك لەو کاتانەیە، (هم)، ژیان ئەمەیە ژیان لە جووڵەدایە و ئێمەش ئەبێ بجووڵێن.

(ها) سەیری هاوڕێ لاوازەکەی کرد و هەوڵی دا قانعی بکات، بەڵام ترسی (هم) بوو بە توورە بوون. ئەو نەیدەویست گوێ بگرێت,

(ها) نەیدەویست بێڕێزی بەرامبەر بە هاوریەکەی بنوێنیت بەڵام ناچار

بوو بە کارە شێتانەکەی خۆیان پێ بکەنێت,

هاوکات لەگەڵ ئەوەشدا (ها) کە خۆی ئامادە ئەکرد, خۆشحاڵیش بوو لەوەی کە توانیویی " بە خۆیێ پێبکەنێت" و ببێتە هوی ئەوەی کە دەست بکات بە جووڵە و گەڕان

(ها) بە پێکەنینەو رای گەیاند :

کاتی رۆیشتنە بۆ نیۆ هەزار کۆنوکەلەبەر.

(هم) نە پێ کەنی و نە وەڵامی دایەوە.

(ها) بەردێکی بچوکی هەڵگرت لە سەر دیوارەکە دروشمیکی گرنگی بۆ (هم) نوسی کە بیری لێ بکاتەوە هەر وەکوو نەریتی خۆی وینەی پەنیریکی کردە باگراوندی دروشمەکە, بەو هیوایەی کە ئەم وێنەیە یارمەتی دەری (هم) بیت بۆ ئەوەی پێ بکەنێت و و گیانیکی پێدا بیتەوە. و بە دۆای پەنیری نوێدا بگەڕیت.

بەڵام (هم) نەێدەویست ببیینێت. دروشمەکە ئەمە بوو.

" ئەگەر خۆت نەگوڕی لە ناۆ ئەچیت"

ئینجا (ها) سەری کێشایە نێۆ هەزار کۆنوکەلەبەرەکە بە نیگەرانیەوە سەیری کرد. بیری لێ کردەو کە چۆن تووشی ئەم بێ پەنیریە بوون.

لە باوەرەدا بوو کە رەنگە لە نێۆ هەزار کۆنوکەلەبەردا هیچ پەنیرێکی لێ نەبێت یان خۆد ئەم نەتوانی بیدۆزێتەوە.

وەها بیرۆکەهایەکی دڵتەزین ئەژنۆی ئەشکاند ونازاری ئەدا.

(ها) پێ کەنی. ئەێزانی کە سەرسووڕمانی (هم) لەوەیە کە " کێ پەنیرەکەێ دەستکاری کردووە؟ "لە حاڵێکدا کە سەرسوورمانی (ها)

لەوەدا بوو کە "بۆ نەمتوانی لە گەڵ جێگۆڕینی پەنیرەکە منیش خۆم بگۆڕم بکەم"؟

لە کاتی چوون بۆ نێو هەزار کۆنوکەلەبەر، ئاوڕی دایەوە و لە بینینی شوێنی پیشتری خۆی هەستی بە ئارامی و دلگەرمی ئەکرد، هەستی ئەکرد حەزی لە شوێنە ژیانە کۆنەکەیەتی، هەر چەند ئەیزانی لەوەی هیچ پەنیریکی لی نەماوە.

(ها) زۆرتر توشی دڵەڕاوکێ بوو لە خەیاڵی خۆیدا وتی: تۆ بڵی بە راستی بیەوێت بڕواتە نێو هەزار کونوکەلەبەرەکەوە.

لە سەر دیوارە بەرانبەرەکەی دروشمیکی نوسی و بۆ ماوەیەك چاوی لێ نەتروکاند، دروشمەکە ئەمە بوو:

" ئەگەر ترس نەبوایت، چیت ئەکرد؟".

(ها) سەبارەت بەم وشەیە بیری کردەوە ئەیزانی هەندیك جار ئەتوانی باش بێت کاتی کە ئێوە لە خراپتر بوونی بارودۆخ دڵەڕاوکیتان هەیە، ئەگەر شتێك نەکەن ترسەکەتان ئەتانخاتە دۆخی ئەنجامی کارێکەو، بەلام ئەوە باش نیە کە ترسەکە بگاتە ئەو ڕادەیە کە ڕێتان لێبگریت بۆ ئەنجامی کارەکە.

سەیری دەستە راستی خۆی کرد، بۆ شوێنیك کە پیشتر هەرگیز نەیبینیبوو، تۆزێ ترسا، هەناسەیەکی قولی هەلمژی، بە لای راستدا گەڕایەوە بە هیواشی هەنگاوی دانا، چووە ئەو شوێنەی کە تا ئەو کاتە نەیدیبوو، لە سەرەتادا لە حالێکدا کە هەوڵی ئەدا ڕێگاکەی خۆی

بدۆزێتەوە، نیگەران بوو لەوەی کە لەوانەیە زۆر لەوێستگەی پەنیرەدا چاوەڕوان بووە " و لەبەر ئەوەی کە ماوەیەکی زۆرە پەنیری نەخواردووە هەستی بە لاوازی ئەکرد، هەر بۆیە ڕێگاکەی، هەزار کونوکەلەبەرەکە درێژتر و سامناکتر لەوەی کەپێشتر هەبوو ئەێنواند.

بڕیاری دا کە ئەگەر دووبارەتوشی وەها بارودۆخێك بوو، زووتر واز لەو شوێنە گەرمونەرمە بیهێنێت و خێراتر خۆی بگۆڕێت.

بەم چەشنە هەموو شتێك ئاسانتر ئەێنواند.

ئینجا پێکەنین هاتە سەر لێوی و لە خەیاڵی خۆیدا وتی:" درەنگ گەیشتن باشتر لە هەرگیز نەگەیشتنە"..

(ها) لە ماوەی چەند ڕۆژی دۆاتر دا لەم لاولەولا چەند لەتە پەنیریکی دۆزیەوە، بەڵام ئەوەندە نەبوو کە بەری دڵ بگرێت، ئەو وا بە تەما بوو کە پەنیرێکی زۆر بدۆزێتەوە و هەندێکی بۆ (هم) بەرێت کە ئەویش هان بدات کە بێتە نێو هەزار کونوکەلەبەرەو.

بەڵام (ها) هێشتا بە پێ پێویست هەستی بە دڵنیایی نەدەکرد. ئەبوایە قبوڵی بکردایە کە هەموو شتیك لە نییو هەزار کونوکەلەبەردا سەرسامت ئەکات و وا دیار بوو کە بارودۆخ لە چاو دوایین جار کە لە نێو هەزار کونوکەلەبەردا گۆڕدراوە.

**" درەنگ گەیشتن باشترە لە هەرگیز نەگەیشتن"**

هەر کات کە هەستی بە پێشرەوی ئەکرد لە نێو ڕاڕەوەکاندا ون ئەبوو، وا دەر ئەکەوت کە بەرەو پێشکەوتنی دوو هەنگاو بۆ پیشەو و یەك هەنگاو بۆ دواوە. ئەم پشکنین و گەڕانە بۆ ئەو وەکوو خەبات و تێکۆشانی لێ

هاتبوو. بەڵام ئەبۆایە دان بە وەدا بنێت کە گەڕانەوە بۆ نێو هەزار کونوکەلەبەر و بە دوای پەنیرادا گەڕان ئەوەندەش کە بیری لێ کردبووەو، قورس نەبوو.

بە تێپەڕبوونی کات لە خۆیی پرسی کە ئایا چاوەڕوانی دۆزینەوەی پەنیری نوێ کارێکی واقعبینانایە؟

نەیدەزانی ئەوپارووەی کە هەڵیگرتووە گەورەتر لە دەمی خۆی یان نا؟

ئینجا پێ کەنی، لە بەر ئەوەی بیری هاتەوە کە تاکوو ئەو ساتە هیچ پارووپەك لە گۆڕێ نەبووە.

هەر کات کە نائۆمید نەبوو دڵنەوایی خۆی ئەکردەوە. ئەو کارەی کە خەریکی ئەنجامی بوو بە هەموو دژواریەکانیەو لە مانەوە لەو بارودۆخە بێ پەنیریە زۆر باشتر بوو.

بڕیاری دا لە جیاتی ئەوەی بارودۆخەکە بە سەریدا زاڵ بێت ئەم بە سەر دۆخەکە زاڵ بێت.

ئینجا بە خۆی وت:

ئەگەر ئسنیف و ئسکری ئەتوانن درێژە بە گەڕانەکەیان بدەن ئەوا منیش ئەتۆانم،

دۆاتر کاتێك کە بیری لە ڕووداوەکانی پێشتر کردەوە، تێگەیشت بە پێچەوانەی بۆچوونەکانی پێشتری: کە پەنیر لە وێستگەکەی پێشووتر بە شەودا ون نەبووە " ئەو ڕێژە پەنیرەی کە لەوی بووە وردە وردە کەم بووەتەوە. و ئەوەی کە ماوەتەوە کۆن و بۆگەنی کردووە.

لەوانەشە کەڕووێ هێنابیت، هەر چەندە ئەو کاتە هیچ گرنگیەکی بەم

بابەتە نەدابوو, لە هەر حاڵێکدا بێ ئەبی دان بەوەدا بنێت گەر بیویستایە ڕەنگە بیتوانیایە ئەو شتەی کە خەریک بوو ڕووی ئەدا هەستی پێبکات بەڵام نەێویستبوو.

(ها) زانیبووی کە ئەگەر لە سەرەتاوە بەو شتەی کە خەریك بوو ڕووی ئەدا و پێشبینی ئەو ڕووداوەی بکردایە، ڕەنگە وەها هەڵەشە نەدەبوو,

لەوانەیە ئەمە هەمان کار بێت کە ئسنیف و ئسکری کردبێتیان.

ئەو بڕیاری دا کە لەمەو بە دوا هەموو کات ئامادە بێت، چاوەڕوانی گۆڕان بێت و خۆی پێشبینی ئەوە بکات،

هیوادار بوو کە پێش ڕووداو هەستە سروشتیەکانی گۆرانەکە پێش بینی بکات تاکوو بتوانی خۆی بۆ گۆنجاندن ئامادە بکات.

ئەو بۆ پشوودان وچانێکی داو لە سەر دیواری هەزار کونوکەلەبەر نوسی:

"پەنیرەکەتان بۆن کەن تاکوولە کاتی کۆن بوونەکەی ئاگادار بن "

(ها) پاش ماوەیەکی دوور و درێژ کە پەنیری پەیدا نەکرد، لە ئەنجام دا وێستگەیەکی گەورەی پەنیری دۆزیەوە کە ئۆمێد بەخش دیار بوو، بەڵام دوای چوونە ژوورەو شۆینی بەتاڵی پەنیرەکەی بینی، زۆر نائۆمید بوو و هەستی کرد کە ئیدی ناتۆانێت بەردەوام بێت.

هەتا ئەرۆیشت تواناى جەستەیی لە دەست ئەدا. ئەیزانی کە ون بووە و ئەترسا کە لە ناو بچیت, بیری لەوە کردەو کە بگەڕێتەوە وێستگە پێشووەکە. بە لایەنی کەمەو ئەگەر بگەڕاێتەوە و (هم) هێشتا لەوی بوایە، ئیدی بەتەنیا نەدەبوو، بەڵام دووبارە هەمان پرسیار ی هەمیشەیی لە خوی کرد (ئەگەر لە ترسا نەبۆایت، ئایا ئەگۆڕام ؟)

(ها) هەستی کرد کە بە سەر ترسی خویدا زاڵ بووە. بەڵام زۆرتر لەوەی کە بیری لیّ ئەکردەوە ترسا بوو. دڵنیا نەبوو کە لە چی ئەترسیّ. بەڵام لەو بارودۆخە کە لە رووی جەستەیەوە لاواز بوو, زانی بە تەنیا بەردەوام بوون لە هەموو شتێك ترسناکترەو ئەم ترسەیّ بووەتە هۆی دواکەوتنی, بەڵام ئەو پێشتر لەم بابەتە ئاگادر نەبوو.

حەزی ئەکرد بزانێت کە (هم) یش جووڵەی دەست پیّ کردووە یان هێشتا بە هۆیّ ترسەوە ئەژنۆی شکاوە, ئینجا باشترین ساتەکانی لە هەزار کۆنوکەلەبەردا بیر هاتەوە، کە ئەو ساتانە بوو کە لە جووڵەدا بوو، ئەو لە بەر ئەوەیّ بە بیری خۆیّ بێنیتەوە و هەروەها هیمایەك بۆ هاورییەکەی بە جیّ بهێڵیت تاکوو ئەو بە ئومێدەو بەرەو ئامانجەکەی هەنگاو بنێت. دروشمێکی لە سەر دیوارەکە نوسی :

" بەڕی بوون بەرەو رێگایەکی نوّی یارمەتی دەر ئەبێت کە پەنیریکی نوّیت دەست کەویت".

(ها) سەیری رێگایەکی تاریکی کرد : لە ترسانا قاچی ئەلەرزا. چی لە رێگامدایە ؟ ئایا بەتاڵە؟ یان خراپتر لەوە، مەترسییێك لە سەر رێگامدایە ؟ هەموو شتێکی ترسناکی کە ریّ تیّ ئەچوو بێنە دی لە ئەندێشەی خۆی دا بیری لیّ ئەکردەوە. ئەو لە ترسا خەریك بوو گیانی دەرچێت.

دوابەدوا بە خۆی پیّ کەنی و زانی ترس دۆخەکە خراپتر ئەکات.

هەر بۆیە ئەو کارەیّ کرد کە ئەگەر نەدەترسا ئەیکرد.

واتە چوون بەرەو رێگایەکی نوّی. لە حاڵیکدا کە بەرەو ڕاڕەوە تاریکەکان ڕایّ ئەکرد، خەندە لە سەر لێوّیەوە بوو. (ها) هێشتا نەیزانیبوو، کە لە

حاڵی بەدەست هینانی ئەو شتەیە کە ژیانی دابین ئەکات.

زۆر لو خۆی دڵنیا بوو, هەر چەند بە راستی نەیدەزانی کە چی دێتە سەر ڕێگای. بەڵام بە سەرسووڕ مانەوە ئەیبینی زۆرتر و زۆرتر چێژ ئەبینێت.

لە خۆی ئەپرسی: بۆ ئەوەندە من حاڵم باشە, من نەپەنیرم پێەو نە ئەزانم بەرەو کۆی ئەچم؟

زۆری ئەخایاند کە زانی بۆ ئەوەندە شادمانە.

راوەستا، تاکوو لەسەر دیوار بنوسی:

"زاڵ بوون بە سەر ترسدا بە مانای ئازادییە"

(ها) بۆی دەرکەوت کە تاکوو ئیستا کۆیلەی ترسی خۆی بووە و بەڕی بوون بەرەو ڕێگایەکی نوی بووەتە هۆی ئازادی ئەو.

ئیستا هەستی ئەکرد کە بایەکی فێنك و خۆش لە لایەکی هەزار کونەوکولوبورەو دێت. چەند هەناسەی قووڵی هەڵمژی و هەستی کرد کە ئەم جم و جوڵە هێزی پێ بەخشیوە، ئیستا بە سەر ترسەکەی زاڵ ببوو، بارودۆخەکە لەوەی کە پێشبینی کردبوو خۆشتر بوو.

ماوەیەکی زۆر بوو کە وەها هەستێکی لە خۆیدا نەدیبوو. بە لایەنی کەمەو فەرامۆشی کردبوو کە ئەم پشکنین و هاتوچۆیە تا چ ڕادەیەك وزەبەخشە.

(ها) لە بەر باشتر کردنی حاڵەتی دەروونی خۆی دووبارە وێنەیەکی لە خەیاڵیدا هێنایە بەر چاو، خۆی لە نێو کۆمەڵێك لەو پەنیرانەی کە حەزی لێ بوو بینیەوە. خۆی بینی لە کاتی خۆاردنی هەموو ئەو پەنیرانەی کە بەتام بوون، و لەو ئەندێشەیە چێژی ئەبرد, ئینجا تیبینی کرد: کە تا

چەند لە خواردنی پەنیرە شازەکان هەستی بە کامەرانی ئەکرد.

هەر ئەوەندە کەبە روونتر خۆی لە حاڵەتی چێژ بینین لە خواردنی پەنیرەکە ئەبینی، هەر ئەوەندەش دۆخەکەی لاوە راستەقینەتر ئەبوو و باشتر بڕوای پێ ئەهێنا.

وا هەستی ئەکرد کە هەر چونێك بێت هەر ئەیدۆزیتەوە .

لە سەر دیوارەکە نوسی:

"بیر کردنەوەم لە کاتی چێژ بردن لە پەنیری نۆی، تەنانەت پێش ئەوەی کە بیدۆزمەوە، من بەرەو ئەو ئامانجە رێنمایی ئەکات"

(ها) هەموو کات لە جیاتی ئەوەی کە بیر لە شکستەکانی بکاتەو بیری لە سەرکەوتنەکانی ئەکردەوە.ئەو سەرسام بوو, کە بۆ هەمیشە وای ئەزانی کە گۆڕان ئەبێتە هۆی خراپتر بوونی بارودۆخەکە. ئیستا پێ زانیوە کە گۆڕانکاری ئەتوانی ئەو بەرەو شوینیکی باشتر هان بدات، پرسیارێکی ئاڕاستەی خۆی کرد:

بۆ تاکوو ئیستا من بەمەم نەزانیوە؟

و ئینجا بە وزەو و خێرایی و لێهاتووانەتر چووە نێو هەزار کونوکەلەبەرەکەوە، زۆری نەخایاند کە ناوەندیکی گەورەی پەنیری بینی و کاتێك سەرەنجی وردە پەنیری نوی بەر دەم دەرگای چوونە ژوورەوەی دا،خۆشحاڵ بوو.

ئەمانە هەموو جۆرە کانی پەنیر بوون کە (ها) پێشتر هەرگیز نەیدیبوو ، بەتام ئەێنواند. تامی کرد تێ گەیشت کە خۆشن.

زۆرترین وردە پەنیرێك کە لە بەردەست دا بوون خۆاردنی. و چەند لەتێکی

خسته گیرفانی تاکوو دۆاتر بیانخۆات. لەوانەشە لە گەڵ (هم) بەشی بکات.

دووبارە ئاهێکی پیا هاتەو.

بە پەلە خۆی کرد بە وێستگەی پەنیردا، بەڵام بینی کە بەتاڵە, کەسێك پێشتر لەوێ بووە و تەنها چەند لەتێ لەو پەنیرە نۆیە بە جێماوە.

زانی کە ئەگەر زووتر بجوڵایت رەنگە بەشێکی زۆرتری بەر کەوتای.

(ها) بڕیاری دا کە بگەڕیتەو وبزانێت کە (هم) ئامادەیە کە هاورێیەتی بکات.یان نا.

لە کاتی گەڕانەوەی بەو ڕاێگایەی پییایدا رۆیشتبوو راوەستا و لە سەر دیوارەکە نوسی:

"هەر چەند خێراتر پەنیرە کۆنەکە واز لێبهێنی،خێراتر پەنیری نۆی پەیدا ئەکەیت".

پاش ماوەیەك (ها) گەڕایەوە وێستگەی پێشتری پەنیر و (هم) ی دۆزیەوە،ئەو لەتە پەنیر نۆیانەی کە لە گیرفانیدا بوو ئاراستەی (هم) ی کرد. بەڵام (هم) قبوڵی نەکرد.

(هم) سپاسی ئەو هەستەی هاوریەکەی کرد بەڵام وتی:

پێم وا نیە کە پەنیری نۆیم بۆیت، ئەمە ئەو شتە نیە کە پێ ڕاهاتووم.من پەنیرەکەی خۆمم ئەوێت من نامەۆیت بە گۆڕانی خۆم ئەو شتەی کە ئەمەوێت بە دەستی بهێنم.

(ها) تەنها بە نائۆمێدیەو سەری لەقاند و بە بێ قسە گەڕایەوە نێو هەزار کۆنوکەلەبەرەکە, کاتێك کە گەیشتە دورترین شۆێن کە پێشتر لەوێ بوو

بیری هاوڕیەکەی ئەکرد، بەڵام زانی حەزی لەو شتەیە کە بەدەستی هێناوە،تەنانەت پێش ئەوەی بگاتە ئەو ئازوقە گەورە پەنیرە کە چاوەڕوانی دۆزینەوەی ئەکرد. لەم بابەتە ئاگادار بوو کە تەنها بە هۆی بوونی پەنیر شادمان نەبوو بەڵکوو بە هۆی زاڵ بوون بە سەر ترسەکەی دا خۆشحاڵ بوو.

بە زانین ئەم بابەتە ئیدی خۆی بەو ڕادەیەی کە لە وێستگەی پێشتری پەنیر دا مابووەو لاواز نەدەزانی.

لە راستیدا زانینی ئەوەی کە بە سەرترسیدا زاڵ بووە ئەبووە هۆی بەهێزتر بوونی، تەنها زانینی ئەم شتە کە جارێکی دیکە ترس ڕێگری نابێت و زانینی ئەمەی کە ڕێگایەکی نوێ گرتووەتە بەر. هێز و توانای پێ ئەبەخشرا.

ئیستا هەستی بەوە ئەکرد کە درەنگ یان زوو بەو شتەی کە ئەیەوێت ئەگات، لە راستیدا هەستی ئەکرد کە ئەو شتەی کە ئامانجی بووە بە دەستی هێناوە. پێکەنی و وتی: (گەڕان و پشکنین لە نێو هەزار کونوکەلەبەر دا، بێمەترسیترە لە مانەوە لە بارودۆخی بێ پەنیریدا).

(ها) لەم ساتەدا زانی کە (ئەو شتەی کە مرۆڤ لی ئەترسی هەرگیز بەو خراپیە نیە کە بیری لێئەکاتەو، ئەو ترسەی کە مرۆڤ لە میشکی خۆیدا پەروەردەی ئەکات زۆر سامناکتر لەوەیە کە لە راستیدا روو ئەدات).

ترس لە نەدۆزینەوەی پەنیری نوێ تووشی وەها ترسێکی کردبوو کە نەیدەویست بە دوایدا بگەڕێت. بەڵام کاتێك دەستی کردەو بە گەشتەکەی. لە ڕاڕەوەکان ئەوەندە پەنیری دەست ئەکەوت کە بتوانێت درێژە بە

گەشتەکەی بدات. ئیستا بە گڕوتینێکی زۆرتر لە جاران بە دوای پەنیری زۆرتردا ئەگەڕا و ئومید بە ئایەندە بوو بە نەریتێك لە ناخیدا.

بۆچونە کۆنەکانی پڕ بوو لە نیگەرانی و دڵەڕاوکی. ئەو پێشتر هەموو کات بیری لە پەنیری پێویست ئەکردەو و خووی گرتبوو زۆرتر بەرەشبینیەوە نەك گەشبینی. بەڵام لەو کاتەوە کە وێستگە کۆنەکەی بە جێهێشت بۆچونەکانی گۆڕدران . پێشتر لەو باوەڕەدا بوو کە پەنیر هەرگیز نابیت جێبەجی بکرێت و گۆڕانکاری کردن کاریکی هەڵەیە.

بەڵام ئیستا بۆی دەرکەوتووە کە گۆڕانکاری بە شێوازیکی سروشتی روو ئەدات

چ چاوەڕوانکراو بێت یان نەبیت. ئەگەر چاوەڕوانی گوڕان نەبن و خۆتانی لە قەرەی نەدەن ئەوا گۆڕانکاریەکە ئەتوانی لە پڕیکدا سەرسامتان بکات.

کاتێك کە زانی کە باوەڕەکانی گوڕاون, راوەستا و لە سەر دیوارەکە نووسی: "بۆچوونە کونەکان بەرەو پەنیری نۆی هانتان ئەدات"

(ها) هیشتا پەنیری نۆیی پەیدا نەکردبوو بەڵام هاوکات کە لە نێو ڕاڕەوەکاندا ئەگەڕا ، بیری لەو شتانە ئەکردەو کە فێری ببوو،

ئیستا زانیویەتی کە بۆچونی نۆی هاندەری رەفتاری نوێن. رەفتاری ئەو لە گەڵ ئەو کاتەی کە سەردانی وێستگە بی پەنیرەکەی ئەکرد گۆڕانکاریەکی بەرچاوی لە خۆ گرتووە.

بۆی دەرکەوتبوو کەکاتێك مرۆڤ باوەڕەکانی خۆی ئەگۆڕی،کاردانەوەکانیشی ئەگۆڕدرێت. ئەکرێت لەو باوەڕەدا بین کە گۆڕان زەرەرمەندە و لە بەرامبەریدا بۆەستینەوە، بەڵام ئەکرێت لەو

باوەڕەدا بێن کە دۆزینەوەی پەنیری نۆی ئەبێتە هۆی ئەوەی کە ئەم گۆڕانکاریە بە ڕەزامەندیەوە قبوڵ بکرێت، ئەمانە هەموو پەیوەندیان بەوەو هەیە کەسەکە چ باوەڕێکی هەڵبژاردووە.

لە سەر دیوارێك نوسی:

"کاتێك ئەزانی کە ئەتوانی پەنیرێکی نوی بدۆزیتەوە و چێژی لی ببینی،ڕێگاکەی خۆت بگوڕە"،

(ها) ئەوەی بۆ دەرکەوت کە ئەگەر زووتر ئەو گوڕانەی پیێ قبوڵ بکرایێت و خێراتر وێستگە کۆنەکەی بە جێ بهێشتای،ئیستا لە بارودۆخیکی باشتر دا ئەبوو، و بە هێزیکی باشترەوە ئەیتوانی چالاکی بۆ بەدەست هێنانی پەنیر نوی بکات، لە ڕاستیدا ئەگەر خوی بۆ گوڕان ئامادە بکردایت و لە جیاتی بە فیڕۆ دانی کات و نکوڵی کردنی گۆڕانکاریەکە کە ڕووی دابوو کاریکی بکردایێت، ڕەنگە ئیستا پەنیرەکەی پەیدا کردبوو.

دووبارە کەڵکی لە هێزی بیر کردنەوەی وەر گرت و خۆی لە دۆخی پەیدا کردن و چێژ بردن لە پەنیری نۆیدا بینی،وە بڕیاری دا کە بڕۆاتە نێو بەشە نەناسراوەکانی هەزار کۆنوکەلەبەرەو، لەم لا ولەولا پارچە پەنیری ئەدۆزیەوە، هەر بۆیە توانا و دڵنیایی بە دەست هێنایەوە.

کاتیك بیری لە ڕابردوو و ئەو شوینەی لیبەو هاتووە ئەکردەوە. شادمان بوو لەوەی کە چەند دروشمیکی لە سەر دیوارەکان بە جی هێشتووە و دڵنیا بوو کە ئەو دروشمانە وەکوو هیمایەك بو(هم) بە نرخ ئەبێت تاکوو ئەگەر وێستگە کۆنەکەی بە جێهیشت بتوانی دوای ئەم بکەوێت.

(ها) هیوادار بوو کە ڕێگایەکی هەڵەی هەڵنەبژاردبێت. بیری لەوە

ئەکردەو کە (هم) دوای دروشمەکانی ئەم بکەویت وە ریگاکەی ئەم بدوزیتەوە. ئەو شتەی کە لە خەیاڵیدا بوو لە سەر دیوارەکە نوسی:

"سەرەنج دان بە جێگەو شوێن و گوڕانە بچوکەکان،یارمەتی دەرن بۆ خۆ ئامادە کردن لە ئەو گۆڕانکاریە گەورانەی کەدیتە سەر رێگات "

(ها) وازی لە ڕابردوو هێنا و خۆی لە گەڵ ئەو ساتە ڕاهینابوو، بە هێز و توانا و خێرایەکی زۆرتر لە نێو هەزار کونوکەلەبەر دا پیشرەوی ئەکرد, پاش ماوەیەك دوور و درێژ، لە ئەنجام دا ئەو رووداوە هاتە دی,

گەشتەکەی –یان با بڵێین ئەم بەشەی لە گەشتەکەی– بە خێرایی و خۆشحاڵیەوە کۆتایی پێهات,

گەیشتە ڕاڕەوێك کە تا ئەو ساتە نەیدیبوو,لەسەر سوچێك پێچی کردەوە و لە وێستگەی "ن"... پەنیری نوی دوزیەوە. کاتێك چووە ژوورەو لەو شتەی کە بینی سەرسام بوو، هەموو دەورووبەری پڕ بوون لە پەنیر واتە: گەورەترین ئازوقەی پەنیرێك کە تا ئەو کاتە بینیبووی.

ئەو زۆربەی پەنیرەکانی نەئەناسی. چونکە هەندێك لەوانەی هەر نەدیبوو، هەر بویە بۆ ساتێك گومانی کرد کە ئەمانە راستەقینەن یان توشی خەیال بووە، تا هاوریە کۆنەکانی...ئسنیف و ئسکری بینی.

ئسنیف بە سەر بەخێر هاتنی کرد و ئسکری دەستیکی بۆ هەڵبڕی، ورگی قەڵەویان دەری ئەخست کە دەمێکە لەوێن، بە پەلە سەلامی کرد و خێرا پەلاماری ئەوپەنیرەیدا کە حەزی لی بوو, کالەکانی لە پێ دەرهێنا، پەتەکانی پیکەوەگری دا خستیە دەور ملی کە ئەگەر دووبارە پێویستی پێبوون لە بەر دەستدا بن.ئسنیف و ئسکری بە زەردەخەنە خۆشحاڵی

خۆیان دەربڕی.

(ها) چووە سەرپەنیرەکان و ئەوەندەی کە بۆ خورا, خۆاردی، پارچە پەنیریکی هەلگرت و بە شادمانیەو وتی:

## درووود بۆ گوڕان

لەو کاتەدا کە (ها) بە چێژوتامەو پەنیرە نۆیەکەی ئەخۆارد، بیری لەو شتانە ئەکرد کە فێر ببوو، ئیستا ئەیزانی ترسی لە ڕابردوو دا تەنها لە بەر ئەو باوەڕانە بووە کە ئیستا لای ئەم هەر مانای نیە.

کە واتە چ شتێك زەبری لی کرد بوو بۆ گوڕان ؟ ئایا ترس لە برسیەتی و مردن نەبوو؟ (ها) زەردەخەنەی هاتە سەر لێو،لەبەر, پێی وابوو کە ئەوەش کاریگەری هەبووە .

دووبارە پێکەنی و بیری کەوتەوە کە گوڕان لەو کاتەوە دەستی پیکرد کە فێر بوو بە هەڵەکانی پیبکەنیت- زانی کە خیراترین ریگا بۆ گوڕان ئەوەیە کە مرۆڤ بتوانیت بە بیرۆکە شێتانەکانی پێبکەنیت وئینجا بە سەربەستی و خیرایی پیشرەویی بکات.

بیری لەو خالە باشانە کردەو کە لە هاوریەکانیەو واتە: ئسنیف و ئسکری فێری بوو, ئەوان ژیانیان زۆر بە ساکاری گرتبوو و بارودۆخیان زۆر بە قورسی شی ناکردەوە، کاتیك کە شوێنەکە گوڕدرا و پەنیرەکە جێبەجیٚ بوو ئەوانیش کاردانەوەیان گۆڕی، (ئەمە هەرگیز لە بیر ناکەم).

(ها) هەروەها لە مێشکی بەهیزی بۆ ئەنجامی کارێك کە مرۆڤە بچکۆلانەکان لە مشکەکان باشتر شارەزایان لی هەبوو کەلکی وەر گرتبوو.

ئەو لە ئەندێشەیدا, خۆی زۆر بە وردی لە کاتی پەیداکردنی شتی نویدا هەست ئەکرد, وە بە بیر کردنەوە سەبارەت بە هەڵەکانی رابردووی و کەڵك وەرگرتنیان بۆ دارشتنی پلانی ئایندەی، , کەڵکی وەر ئەگرت.

ئەو ئەیزانی کە ئەنجامی فێر بوونی چۆنیەتی بەرامبەر بوونەوە لە گەڵ گۆڕانکاریەکان ئەوەیە کە بارودۆخەکە بە ساکاری هەڵسەنگینیت، شیاوی گۆڕان بوو و خێرا دەست بە کار بوو.

پێویست ناکات کە بابەتەکان لە ڕادە بە دەر ئاڵوز بکەین یان بە ئەندێشەی سامناك خومان بخەینە گێژاوەو. ئەکرێت بە لە بەر چاو گرتنی گۆڕانکاریە بچوکەکان،خومان بە شێوازیکی باشتر بۆ گۆڕانێکی گەورەتر کە لە رێگامان دایە ئامادە بکەین.

زانی کە ئەبیت خۆی پێشتر لە گۆڕانەکان ئامادە بکات لە بەر ئەوەی ئەگەر لە کاتی خۆیدا ئەوە نەکات رەنگە زۆر درەنگ بێت.

ئەبۆای قبوڵی بکردایت کە گەورەترین رێگری گۆڕان لە ناخی خۆێدایە و تاکوو مرۆڤ نەگۆڕدرێت هیچ شتێك باشتر نابێت. لەوانەیە گرنگترین شتیك کە فێری بوو ئەوە بوو کە هەمیشە پەنیری نوێ لە شوێنیکی دیکەیە. چ کاتی خۆیداپیٚ بزانن یان نەزانن.

مرۆڤ کاتێك پاداش وەر ئەگرێت کە بە سەر ترسیدا زاڵ بێت و حەزی لە بەرەنگار بوونەوە هەبێت، ئەو ئەیزانی کە ئەبێت ڕێز لە هەندێك لە ترسەکان دابنێت لە بەر ئەوەی کە: مرۆڤی لە هەندێك لە مەترسیەکان ئەپاراست. بەلاّم بۆی دەر کەوّت کە زۆربەی ترسەکانی ژیرانە نەبووە و رێگری بوون کە لە کاتی خۆێدا بگۆڕدرێت.

لەو كاتەدا هەستی بەم شتە نەكردبوو بەڵام ئیستا ئەیزانی كە ئەم دیار نەمانە خێری پێەو بووە و گۆرانەكە دیارییەك بووە كە لە سروشەوە هاتووە .

ئیستا ئەو تەنانەت هەستی بەلێهاتوویەكانی خۆشی ئەكرد، بە بیر كەوتنەوەی ئەم شتانە, بیری (هم) كەوتەوە.

حەزی ئەكرد بزانێت كە ئایا (هم) هیچ كام لە دروشمەكانی خوێندووەتەوە، لە وێستگەی پێشتر و لە دار و دیواری نێو هەزار كونوكەلەبەردا نوسیبووی ئایا خوێندوویە یان نا؟ ئایا هێشتا بڕیاری بە وازهێنان و جوڵە داوە؟

ئایا هاتووەتە نێو هەزار كونوكەلەبەر و ئەو شتەی ئەبوو هۆی ژیانێكی باشتر بۆ ئەو ئەنجامی داوە یان لەبەر ئەوەی كە نەیدەویست گۆڕانكاری لە خۆیدا بكات هێشتا خۆی حەشار داوە ؟

(ها) ئەیویست بۆ پەیدا كردنی هاوریەكەی (هم) دووبارە بگەرێتەوە بۆ ناوەندی پەنیرە كۆنەكە بەڵام ترسی ون بوونی هەبوو.

ئەندێشەیەك هاتە مێشكی كە ئەگەر (هم) بدۆزیتەو لەوانەیە پێبكرێت كە رێگای دۆزینەوەی رزگاری لەو گرفتەی بۆ ئاسان بكات، بەڵام بیری كەوتەو كە پێشتریش هەوڵی داوە كە هاوریەكەی هان بدات بۆ گۆڕانكاری لە خۆیدا..

(هم) ئەبوای رێگاكەی،بە سەر ترسدا زاڵ بوون و تێپەڕ بوون لە خۆشی پەیدایٚ بكات. كەسیكیتر نەیدەتوانی ئەم كارەی بۆ ئەنجام بدات. یان رازی بكات. ئەو ئەبوای خۆی لە قازانجی گۆڕانكاری تێبگەشتایە.

---

(ها) ئەیزانی هەلێکی بۆ (هم) داناوە کە بە خوێندنەوەی ئەو دروشمانە ڕێگاکەی خۆی بدۆزێتەوە. دووبارە کۆرتکراوێك لەو شتانەی کە فێر ببوو لە سەر گەورەترین دیواری وێستگەی پەنیری "ن" نوسی. ئەو بەدەستهاتەکانی لە سەر وێنەی پەنیرێکی گەورە نوسی. ئینجا سەیری ئەو زانستە کە بە دەستی هێنابووی ئەکرد و پێ کەنی.

دروشمەکانی سەر دیوارەکە ئەمانە بوون....

""" گۆڕانکاریەکان ڕوو ئەدەن. بەردەوام پەنیرەکە جێبەجێ ئەکەن. چاوەڕوانی گۆڕانکاری بن. ئامادەی جێبەجێ کردنی پەنیرەکە بن. گۆڕانکاریە کان کونترۆڵ بکەن بەردەوام بۆنی پەنیرەکەتان بکەن تاکوو بزانن چ کات کۆن ئەبێت. خێرا خۆتان لە گەڵ گۆڕانکاریەکان ڕابێنن. بە هەر خێرایەك واز لە پەنیرە کۆنەکە بهێنن, هەر بەو خێرایەش ئەتوانن چێژ لە پەنیری نوێ ببینن.خۆتان بگۆڕن. لە گەڵ پەنیر دا بجوڵێن. چێژ لە گۆڕان ببینن. چێژ لە بوێری و تامی پەنیری نوێ بەرن. هەمیشە ئامادەی گۆڕانکاری خێرا بن و هەر جار چێژی لێ ببینن. ئەوان بەبەردەوامی پەنیرەکە جێبەجێ ئەکەن. "

(ها) هەستی کرد بۆچونەکانی لە چاو ئەو کاتەی کە لەگەڵ (هم) لە وێستگە کۆنەکە ئەژیا زۆر گۆڕاوە. بەڵام ئەیزانی ئەگەر هەموو شتێك بە هەمیشەیی بزانیت ڕەنگە بە ئاسانی ببێتەوە بە هەمان مرۆڤی ڕابردوو.

هەربۆیە هەموو ڕۆژێك پشکنینی وێستگەی پەنیری "ن" ی ئکرد تا بزانیت پەنیرەکی چی بە سەر هاتووە بڕیاری دابوو کە نەهێڵێت هیچ گۆڕانکارییەکی ناکاو رایبگریت.

بەوەیکە کە هێشتا ئازوقەیەکی گەورەی پەنیری لە بەر دەست دا بوو بەردەوام ئەچووە نێو هەزار کونوکەلەبەر و بە دوای شوێنی نوێ بدۆزیتەو تا بتوانی لە گەڵ گۆرانە نوێەکانی دەوروبەری کارا بێت...ئەیزانی کە ئاسایش، زانیاری لە دەوروبەرە،نەك حەشار دانی خۆ لە بارودۆخی ئاسوودەیی دا.

(ها) دەنگێکی بیست، لەوە ئەچوو کە کەسیك لە نێو هەزار کونوکەلەبەردا بجولێت،هەروەها کە دەنکەکە بەرزتر ئەبیسترا.تێگەیشت کە کەسێك خەریکە دێت.تۆ بلێیت (هم) لەم دەوروبەرە بێت ؟ ئایا بە راستی گۆرانکاری بە سەر دا هاتووە؟ (ها) بە ئومیدەوە ئاواتە خوازبووکە — هەر بەو شێوەیە کە ئەم ئەو کارەی کردووە— کە لە ئەنجامدا هاوریەکەیشی ئەم توانایە بە دەست بێنیت

لە گەڵ پەنیرەکەتان بجوولێن تاکوو چێژی لێ بەرن

کۆتایی یان دەست پێ کردنی نۆی

*********

## تۆیژینەوەیەك لە دۆانیوەروی هەر ئەو رۆژەدا

کاتێك کە مایکڵ کۆتایی بە داستانەکەی هێنا سەیری دەوروبەری خۆی کرد.بینی کە هاورێیە کۆنەکانی بە دەمیەو پیّ ئەکەنن.

چەند کەسێکیا سپاسیان کرد و وتیان کە زۆر شتی باشیان لەم داستانە وەر گرتووە.

ناتان پرسیاری لە هەمووان کرد:

راتان چیە کە کاتێك دیاری کەین و جارێکی دیکە سەبارەت بەم داستانە قسە بکەین؟

زۆربەیان بە دڵیان بوو، هەر بۆیە دانیشتنێکیان ساز کرد بۆ پێش نانی ئیوارە. ئیوارە چوون بۆ تەلاری ئۆتیلیك. گاڵتەیان بە یەکتر ئەکرد و لە ئەندێشە دا خۆیان لە نیۆ هەزار کونوکەلەبەر لە کاتی دۆزینەوەی پەنیر دا ئەبینی.

ئینجا ئانجێلا بە دەم بە خەندەو لە هاوریەکانی پرسی :

باشە،ئیوە کامیەك لە کەسایەتیەکانی نێو داستانەکە بوون ؟ ئسنیف، ئسکری, (هم) یان(ها)؟

کارلۆس وەڵامی دایەوە:

باشە,من هەر ئەم نیوەرۆیە بیرم لەم شتە ئەکردەوە, زۆر باش بیرم دێت کە بازەرگانی کەل و پەلی وەرزشی بووم و هەر لەو کاتە دا توشی گۆڕانێك هاتم.

من،ئسنیف نەبووم و بۆنی دۆخەکەم نەکرد و خێرایی گۆرانەکەم هەستپێنەکرد.

بە دڵنیاییەوە ئسکریش نەبووم لە بەر ئەوەی خێرا کاردانەوەم نەبوو.

زۆرتر لە کەسایەتی (هم) ەو نزیکتر بووم کە ئەیویست لە ناوچە پارێزراوەکی خۆی بمێنیتەو.لە راستی دا نەمدەزانی لە گەڵ ئەو گۆرانەدا خۆم رابینم تەنانەت نەمدەویست گۆڕانەکە ببینم.

مایکڵ کە وا هەستی ئەکرد کاتێکی زۆری نەخایاندووە لەو کاتەوە کە لە گەڵ کارلۆس قوتابی بوون وتی:

هاورێ: ئیمە لیرە سەبارەت بە چی قسە ئەکەین؟

کارلۆس وتی:

گۆرانێکی چاوەروان نەکراوی ئیش.

مایکڵ پێکەنی : .

دەریان کردی؟

- تەنها ئەوە ئەڵیم کە نەمدەویست بە دۆای پەنیرێکی نۆی دا بگەرێم و پێم وا بوو کە بۆ سەلماندنی ئەمە خۆ نابێت گۆران لە من دا روو بدات، بەڵگەیەکی باشم پێە هەر بۆیە ئەو کاتە زۆر بێزار بووم.

هەندێك لە هاوریان کە لە دەست پێکردنی بابەتەکەوە بێدەنگ بوون ئیستا بە ئاسوودەیی قسەیان ئەکرد و هاتنە لێدوانەکانەو. بۆ نمونە فرانك کە چووبووە ریزی سۆپاوە.

فرانك وتی:

(هم) بیری یەکیك لە هاوریەکانی خستم. ئەو بەشەی کە ئەو لەوی ئیشی

ئەکرد، بە تەمای هەڵوەشاندنی بوون بەڵام ئەو هاوڕیەم نەیئەویست قبولی بکات. کۆمپانیا بەردەوام کارمەندەکانی جێبەجیّ ئەکرد. ئێمە هەموومان هەوڵمان ئەدا لەگەڵیدا سەبارەت بە هەلی زۆر کە کۆمپانیا بۆ ئەو کارمەندانەی کە نەرم و نیانترن، قسە بکەین، بەڵام ئەو لەو باوەڕەدا بوو کە ئەو هیچ ناچار نیە کە گۆران لە خۆیدا بکات. کاتێك کە بەشەکەی ئەو داخرا ئەو تەنها کەسێك بوو کە سەرسام بوو. ئیستا دۆخی زۆر خراپە لەبەر ئەوەی ئەبێت خۆی لە گەڵ گۆڕانیك دا بگونجینیت کە هەر بیریشی لیّ نەکردووەتەو.

جێسیکا وتی:

منیش پێم وا نەبوو کە هەرگیز گۆڕانیك لە مندا روو بدات.بەڵام پەنیرەکەی من زۆرتر لە چەند جار جێبەجیّ بووە. بە تایبەت لە ژیانی خێزانیمدا کە ئەوە دادەنێن بۆ کاتێکی دیکە.

زۆربەیان پێکەنین جگە لە ناتان.

ناتان وتی:

لەوانەیە خاڵە سەرەکیەکە هەر ئەمە بێت کە گۆڕانکاری بۆ هەمووما‌ن روو ئەدات و هەر وەها وتی :

خۆزگە خیزانەکەم پێشتر ئەم داستانی پەنیریان ببیستایّ بە داخەوە ئێمە نەماندەویست ئەو گۆڕانکایانەی کە لە کەسابەت دا روو ئەدات قبولّ بکەین و ئیستا زۆر درەنگە. هەر بۆیە ناچار بووین کە زۆربەی فرۆژگاکانمان دا بخەین.

ئەم رووداوە زۆربەیانی سەرسام کرد.

له بەر ئەوەی پێیان وا بوو کە ناتان زۆر شانسی هەیە کە کارێکی بەردەوامی هەیە و ئەیتوانی هەتا هەتایە بێخەم بێت.

جێسیکا کە حەزی ئەکرد لە رووداوەکە بزانێت،پرسی:

چی روویدا؟

ناتان وتی :

کاتێك فرۆشگا گەورەکان بە کەل و پەلی جۆراوجۆر و نرخی کەم هاتە بازارەوە.فرۆشگا بچوکەکانی ئێمە لە پڕیکدا باوی نەما. و ئیمە بە راستی نەمانتوانی بەربەرەکانی بکەین ئیستا ئەتوانم بزانم کە لە جیاتی ئەوەی وەکوو ئسنیف و ئسکری بین زۆرتر وەکوو (هم) رەفتارمان کرد. لەبەر ئەوەی هەر لەو رادەیە کە بووینماینەوە و نەگۆڕاین. بەردەوام هەوڵمان دا ئەو شتەی کە خەریکە روو ئەدات نەبینین و ئیستا کەوتوینەتە گێژاوەو.

خۆزگە ئەمانتوانی یەك، دوو شت لە (ها) فێر ببین لە بەر ئەوەی ئێمە نەمانتوانی بە خۆمان پێبکەنین و و رێگەی خۆمان بگۆڕین.

لۆرا کە لە بازرگانیدا ژنێکی سەر کەوتوو بوو و تا ئیستا تەنها گوێی گرتبوو و زۆر کەم قسەی کردبوو وتی:

منیش دوانیوەڕو بیرم لەم داستانە کردەو، بیرم لێ کردەوە کە چۆن ئەتوانم وەکوو (ها) بم، هەڵەکانم ببینم،بە خۆم پێبکەنم خۆم بگۆڕم و باشتر کار بکەم.

هەروەها وتی:

حەز ئەکەم بزانم لێرە چەند کەسی لێە کە لە گۆڕان ئەترسن ؟ کەس

وەڵامی نەدایەوە، پێشنیاری کرد :

پێتان چونە دەست هەڵبڕین.

تەنها یەك کەس دەستی هەڵبڕی.

واتە: وا دەر ئەکەوێت کە لە ناوماندا تەنها یەك کەسی راستگۆمان هەیە.

ئینجا وتی :

رەنگە زۆرتر حەزتان لە پرسیاری داهاتوو بێت. ئێرە چەند کەسی لێیە کە پێیان وایە ئەوانی دیکە لە گۆڕان ئەترسن؟

هەمویان دەستیان هەڵبڕی.و هەموو بوون بە پێ کەنینەوە.

لۆرا وتی:

ئەمە چیمان پێ ئەڵێت؟

ناتان وەڵامی دایەوە:

دان پێدانەنان. .

مایکڵ وتی :

بە دڵنیایەوە زۆر جار ئێمە ئاگامان لە ترسی خۆمان نیە،بەڵام زۆر حەزم لەو پرسیارە کرد کە وتی "ئەگەر ناترسابایت چیت ئەکرد؟"

دوای ئەو جێسیکا وتی:

باشە ئەو شتەی کە من لەم داستانە تێگەیشتم ئەوەیە کە گۆڕان لە هەموو شوێنێك روو ئەدات. وە کاتێك من ئەتوانم کاردانەوەم هەبیت کە بتوانم خێرا خۆم بگونجێنم، بیرم دێت کە رێکخراوەکەی ئیمە فرۆشی کتێبیکی فەرهەنگی بیست و قسورێك جلدی گرتبووە ئەستۆ،یەکێك پێشنیاری کرد کە هەموو فەرهەنگەکە لە بەرنامەیەکی کومپیوتریدا کۆپی

بکەین و بە هەرزانتر بیفرۆشین. لەبەر ئەوەی کە ئەکرێت زانیاریەکان بە ئاسانی بکەینە ئەو مۆدەی کە باوە. و دراوی بەرهەمەکانیش کەم ئەبێتەوە و هەر وەها خەڵکیش زۆرتر ئەتوانن بیکڕن.بەڵام ئیمە دژایەتیمان کرد.

ناتان پرسی:

بۆ دژایەتیتان کرد؟

لە بەر ئەوەی لەو باوەڕەدا بووین پێگەی سەرەکی بازرگانی ئیمە دەستگیرەکانن و راگرتنی ئەم هێزی کارە بەستراوەتەوە بە دەست کەوتیان و فرۆشی بەرهەمەکانی ئیمە. تا ماوەیەکی زۆر لەم کارەدا سەرکەوتوو بووین و پێمان وا بوو کە ئەم سەرکەوتنە هەتا هەتایە هەر بەردەوام ئەبیت.

لۆرا وتی:

- لەوانەیە لەم داستانەدا لە خۆ بایی بوون لە بەر سەرکەوتنی (هم) و (ها) هەر ئەم مانایە هەبیت. ئەوانیش بیریان لەم شتە نەکردووەتەو کە پێویستە ئەو رێگایەی کە کاتی خۆی کاریگەری هەبووە، بگۆڕن.

ناتان وتی:

واتە ئێوە پێتان وا بوو کە تەنها پەنیرێك کە ئەتوانن بتانبێت هەمان پەنیرە کۆنەکەیە ؟

بەڵی. و ئەمانویست لە دەستی نەدەین!

کاتێك بیر لە رووداوە کۆنەکان ئەکەمەوە ئەبینم کە تەنها خەڵك نین پەنیرەکە جێبەجێ ئەکەن بەڵکوو پەنیر بە سەرەیە و لە ئەنجامدا

پیّ دێت.

به هەر حالّ ئێمە نەگۆراین. بەلاّم بریکاریك ئەو کارەی کرد و ریّژەی فرۆشی ئیمە زۆر دابەزی.و هەتا ئیستاش فشارێکی زۆرمان لەسەرە. ئیستا گۆرانکاری زەبەلاحی تێکنۆلۆژیا له پیشەسازی دا له ئارا دایه و وا دیاره له کۆمپانیا کەس نایەوێت خۆی سەر قالّی ئەوە بکات.ئەم بابەتە تا رادەیەك جێگەی نیگەرانیە. پێم وابی پاش ماوەیەکیتر کارەکەم له دەست ئەدەم.

کارلۆس به دەنگی بەرز وتی:

کاتی چوونه ژورەوەیه بۆ ناو هەزار کونوکەلەبەر.

هەموو پێکەنین, هەر وەها جێسیکاش.

کارلۆس رووی کرده جێسیکا و وتی:

ئەوەت باشه که تۆ ئەتوانی به خۆت پێبکەنیت.

فرانك پێوتن:

ئەمە ئەو شتەیه که من لەم داستانه فێر بووم. من زۆربەی جار زۆر له خۆم بایی ئەبم, بەلاّم تێگەیشتم که چۆن (ها) کاتێك توانی به خۆی و کارەکانی پیّ بکەنێت گۆردرا به (ha).نابێت سەر سام بین که ناوی (ها)له راستیدا (haw) بووه "به مانای هەلّۆیه"..

دانیشتوان تازه به کایەی ئاشکاری وشەکانیان زانی.

ئانجێلا پرسی:

به رایّ ئیوه ئایا (هم) گۆرا و پەنیری نۆییەی پەیدا کرد ؟

ئێلین وتی:

من پێم وایە کە پەیدای کرد.

کوری وتی:

من پێم وا نیە، هەندێك لە مرۆڤەکان هەرگیز ناگۆڕدرن وە زەرەرمەندیش ئەبن. من لە کاری پزیشکی خۆمدا مرۆڤی وەکوو (هم) م زۆر بینیوە.ئەوانە پەنیرەکە بە مافی خۆیان ئەزانن و کاتێك کە لیان وەر ئەگیرێتەوە وا هەست ئەکەن کە خەڵك تاوانبارن. ئەوان زۆرتر لەو کەسانەی کە واز ئەهێنن و دووبارە دەست پیێ ئەکەنەو نەخۆش ئەکەون.

ئینجا ناتان بە هێواشی کە هەست ئەکرا ورتە ورت ئەکات وتی:

پێم وایە کە ئەمە جێگای پرسیارە کە چی واز لێبێنین و بەرەو چی هەنگاو بنێین ؟

چەند ساتێك کەس هەموو بێدەنگ بوون.

ناتان وتی:

ئەبێ دان بەوەدا بنێم کە ئەو دۆخە کە بۆ فرۆشگاکانی وەکوو ئێمە لە شۆێنەکانی دیکەی وڵات رووی دا من ئاگادار بووم. بەڵام هیوادار بووم کە کاریگەری لە سەر ئێمە نەبێت. پێم وابێت ئەگەر مرۆڤ بتوانێت بەرەو پێشئوازی گۆڕانکاریەکان بڕوات باشتر لەوەیە کە چاوەڕوانی گۆڕانکاریەکان بێت و ئینجا بیەوێت خۆی لە گەڵیدا رێك بخات،

لەوانەیە پێویستە ئێمە خۆمان پەنیرەکەمان بجولێنین ؟

فرانك پرسی:

مەبەستت چیە ؟

ناتان وتی:

به دەست خۆم نیە، بەلاّم بەردەوام لەو ئەندێشەیە دام کە ئەگەر هەموو فرۆشگا کۆنەکانمان لە کاتی خوێدا بفرۆشتایەوە و لە جیاتی ئەمانە فرۆژگایەکی نوێ و گەورەمان درووست بکردایەو کێبەڕکیمان لە گەلّ فروشگا باشەکان بکردایە ئەمڕۆ لە چ پلەیەکی بازار دا ئەبووین؟

لۆرا وتی:

لەوانەیە مەبەستی (ها) کە کاتێك لە سەر دیوارەکە نوسی "چێژ لە بوێری و تامی نۆی پەنیر بەرن" هەر ئەمە بێت.

فرانك وتی:

پێم وابێت هەندێك شت نابێت بگۆردری بۆ نمونە نرخە بنچینەیەکان, بەلاّم ئیستا زانیم کە ئەگەر لە ژیانمدا زووتر لە گەلّ "پەنیر" هەنگاوم هەلّگرتایە سەر کەوتوو تر ئەبووم.

ریچارد کە رەشبینی پۆلەکەیان بوو وتی:

باشە مایکلّ، کۆرتە داستانێکی باش بوو، بەلاّم ئیوە چۆن لە کۆمپانیادا لەم بابەتە کەلّکتان وەر گرت؟

ئەو کۆمەلّە هاورییە نەیانزانی کە ریچارد خەریکی گۆڕانکاریەك تاقی ئەکاتەو. لەم دوایە دا لە هاوسەرەکەی دابڕاوە و هەولّی ئەدا لە نێوان ئیش و گەوّرە کردنی منداڵەکانی دا یەکسانیەك دروست بکات.

مایکلّ وەلاّمی دایەوە: ئەزانی چیە, هەر وەها کە وتم هەستم ئەکرد کە کارم ئەوەیە کە تەنها رۆژانە کێشەکان چارە سەر بکەم لە حالّێکدا کە ئەوەی ئەبۆای بمکردای پێشبینی و سەرەنجی رێگای ئایندەی کۆمپانیا بوو. ئایا ئەتوانی ئەوە بێنیتە بەر چاوّ کە چۆن ئەم شتانە هەموو

رۆژەکانی منی بە خۆەۆ بەستبووەو ؟ من سەرقاڵی کارەکان بووم و ئەمدەتوانی خۆم ئازاد بکەم. تا ئەو رادەیە کە کەس تاقەتی لێم نەبوو.

لۆرا وتی:

واتە لە جیاتی رێنمایی کردن، سەرپەرەشتیت ئەکردن.

مایکڵ وتی:

بە دڵنەواییەو، کاتێك کە داستانی "کێ پەنیرەکەی دەست کاری کردم؟م بیست،ئینجا زانیم کەکاری من کێشانی وینەیەکی پەنیری نوێیە کە هەمووومان بە دوایدا ئەگەڕاین و ئەو کاتەی دەستمان کەوت، چێژمان لە گۆڕان و سەرکەوتن ئەبینی، چ لە کار و چ لە ژیان دا.

ناتان پرسی:

لە کومپانیا چیتان کرد؟

کاتێك لە کارمەندەکانی کۆمپانیام ‌پرسی کە ئەوان وەکوو کام یەك لە کەسایەتی داستانەکەن، بینیم کە لە هەر چوار کەسایەتیەکە لە کۆمپانیاکەماندا هەیە، و تێگەیشتم کە لە گەڵ ئسنیف و ئسکریەکان و (هم) و(ها) کاندا ئەبێت بە شێوازیکی جیاواز رەفتار بکرێت.

ئسنیفەکانمان ئەیانتوانی بۆنی گۆڕانکاریەکانی نێو بازار بکەن، واتە ئەوان یارمەتیان داین کە دیدگای کۆمپانیا مودێرن بکەین. هانمان دان کە بۆ ڕاکێشانی مۆشتەری زۆرتر ئەو گۆڕانکاریانەی کە پێویستە لە بەرهەمەکانی کۆمپانیا دا ئەنجام بدرێت, دەست نیشانی بکەن.

ئسنیفەکان پێیان ڕاگەیاندین کە لەوەی کە ئەرکیان دەست نیشان کردنی بارودۆخ و گۆڕین لە کاتی خۆیدا یە زۆر خۆشحاڵن.

ئسكريەكانمان حەزيان ئەكرد كە كارا بن هەر بۆيە كردمانن بە پێشرەوی جووڵەكانمان، ئەمانە تەنها پێويست بوو كە كونترۆل بكرين كە بە هەڵەدا نەڕون و ئينجا بۆ چالاكيەكانيان پاداشتيان وەر گرت.

ئەوان پێيان خۆش بوو كە لە كۆمپانيايەك كار دەكەن كە رێز لە چالاكيەكان و ئەنجامەكانی ئەگيريت.

ئانجێلا پرسی:

ئەی سەبارەت بە (هم) و (ها) چی؟

مايكلّ وەلامی دايەوە:

بە داخەوە(هم) ەكان وەكوولەنگەر بوون كە خێرايەكانيان لێ كەم ئەكردينەو، ئەمانە يان زۆر حەۆابوونەوە يان زۆر لە گۆڕان ئەترسان.هەنێك لە (هم) ەكانی ئێمە كاتێك گۆڕان كە وێنەيەكی روون لە بەنرخی گۆڕانەكەيان بۆ كێشرا. (هم)ەكانمان پێ راگەياندين كە ئەيانەوەی لە شوێنيكی پارێزراو ئيش بكەن. هەر بۆيە ئەبێت درك بە گۆڕانەكان بكەن تا زۆرتر هەست بە ئاسايش بكەن كاتێك كە ئاگايان لە مەترسی راستينی نەگۆڕان پەيدا كرد هەندێكيان گۆردران و كاردانەوەی باشيان هەبوو، ئەم تاقی كردنەوەيە بووە هۆی ئەوەی كە زۆربەی (هم)ەكان هان بەين كە ببن بە (ها).

فرانك پرسی:

ئەی چيتان لەو (هم)انە كرد كە نەگۆڕان؟

مايكلّ بە هەناسە هەڵكێشانەو وتی:

ناچار بووين كە دەريان كەين.

ئیمە ئەمانویست کە هەموو کارمەندەکانمان لا بمێنن بەڵام ئەشمانزانی کە پیشەکەمان خێرا نەگۆڕین هەموومان توشی کێشە ئەبین.

ئینجا وتی:

هەواڵی خۆش ئەمە بوو کە (ها) کانی ئیمە لە سەرەتاوە گومانیان هەبوو بەڵام بایی ئەوەندە روناکبیر بوون کە کە شتی نوێ فێر بن و بە شێوازیکی دیکە کاردانەوەیان هەبیت. و لە کاتی خوێدا خویان لە گەڵ بارودۆخەکە بگونجینن. تا ببێتە هۆی سەرکەوتنمان.

ئەوان چاوەڕوانی گوڕان بوون و بە دوایدا ئەگەڕان و لەو رووەو کە سرۆشتی مرۆڤیان ئەناسی یارمەتیان داین تا وێنەیەکی راستی لە پەنیری نوێ بکێشین کە لە ئەنجامدا لە گەڵ کارەکاندا بگونجێت. ئەوان پیان راگەیاندین کە ئەیانەویت لە کۆمپانیایەك کار بکەن, کە متمانەیان بە کارمەندەکانیان هەبێت و مەجالی گۆڕانیان پیێ بدەن.

یارمەتیان داین کە هاو کات لەگەڵ ئەوەی کە بە دوای پەنیری نوێدا ئەگەڕاین توشی داروخان نەبین.

ریچارد وتی:

تۆ ئەم هەموو شتەو لە داستانیکی وەها بچووك وەرگرتووە ؟

مایکڵ پێکەنی :

تەنها داستانەکە نا، بەڵکوو ئەنجامگای کەسایەتیمان بەوەی کە بووە هۆی کاردانەوەی جیاوازمان.

ئانجێلا دانی بەوە دا نا کە من تا ڕادەیەك لە (هم) ئەچم، هەربۆیە سەرەنج ڕاکێشترین بەشی داستانەکە ئەوە بوو کە (ها) بە ترسی خوی پێکەنی.و

دەستی کرد بە کێشانی وێنەیەك لە خەیاڵیدا، تا ئەو ڕادەیە کە خوی لە کاتی چێژ بینین لە خواردنی پەنیری نوێدا دیتەوە. و هەر ئەم شتە بووە هویٚ کەم بوونەوەی ترس بۆ چوونە ناوەی هەزار کونوکەلەبەر و دڵخۆشتری کردن. و لە ئەنجامدا گەیشتە دەستکەوتێکی باشتر. ئەمە هەر ئەو شتەیە کە من حەز ئەکەم ئەنجامی بدەم.

فرانك بە حاڵەتیکی گاڵتە ئامێزەو وتی:

کە واتە (هم) ەکان هەندێك جار ئەتوانن تێبگەن کە گۆڕانەکان کەڵکی هەیە.

کارلۆس پێکەنی :

وەکوو قازانجی لە دەست نەدانی ئیشەکەیان.

ئانجێلا وتی :

یان تەنانەت  بەرزبوونەوەی پلەوپایە.

ریچارد کە بە درێژایی ئەو ماوەیە مۆنی کردبوو وتی:

بەر پرسەکەم لەم ماوەیەدا ئەڵی کە کۆمپانیا کەمان پێویستی بە گۆڕانە بەڵام من وا ئەزانم کە مەبەستی ئەوەیە کە من پێویستم بە گۆڕانە.بەڵام من نەمۆیست قبولی بکەم و وا ئەزانم کە هەرگیز نەمزانی کە بە راستی ئەو پەنیرە نوێەی کە ئەو هەوڵی ئەدا پیێ بگەیین چی بوو؟ یان چۆن ئەمتوانی لی سوودمەند بم. ریچارد بە دەم بە خەندەو وتی:

ئەبیێ دان بەوە دا بنێم کە هەستی بینینی پەنیری نۆی و چێژ لیێ بردنم بە لاوە خۆشە. چون بەم جورە هەموو شتێکم بەلاوە سادە و ساکارە. مرۆڤ کاتێك کە ئەبینیێ کە چۆن ئەتوانی بارودۆخەکە چاك بکات زۆرتر حەز بە

گۆڕان ئەكات. لەوانەیە كە لە ژیانی خێزانی خۆمیشدا بتوانم لەم شتە كەڵك وەر گرم.

هەر وەها وتی:

منالەكانی من پێیان وایە كە هیچ شتێك نابێت لە ژیانیاندا بگۆڕدرێت. پێم وایە كە ئەوان وەكوو (هم) رەفتار ئەكەن. هەر بۆیە ئالۆزن و رەنگە ترسی ئایەندەشیان هەبیت.لەوانەیە كە من وێنەی پەنیری نۆیم بۆ نەكێشاون، رەنگە من خۆشم ئەوەم نەزانیوە،

هاوریان هەموو بێدەنگ بوون، چەند كەسێكیان بیریان لە ژیان خێزانی خۆیان ئەكردەوە.

ئالێن وتی:

باشە زۆربەتان سەبارەت بە ئیش قسەتان كرد. بەڵام من كاتێك گوێم لە داستانەكە گرت بیرم لە ژیانی تایبەتی خۆم كردەوە. پێم وایە پەیوەندیەكانی ئیستای من،وەكوو پەنیرێكی كۆنە كە كەڕویەكی زۆر دایپۆشیووە.

كوری هاوڕا لە گەڵیدا پێكەنی وتی:

منیش هەر وەها، رەنگە پێویست بكات كە منیش،خۆم لە داووی پەیوەندیەكی خراپ رزگار بكەم.

ئانجێلا دژایەتی كرد و وتی:

لەوانەیە پەنیری كۆن تەنها رەفتارە كۆنەكانمان بن، ئەو شتەی كە زۆر پێویستمانە كە خۆمانی لێ رزگار بكەین هەر ئەم رەفتارەیە كە ئەبێتە هۆی ئەوەی كەپەیوەندی خراپمان هەبێت، كە واتە باشتر ئەوەیە كە

ژیرانەتر کاردانەوەمان هەبێت.

کوری خۆی هەڵکۆتایە نێو قسەکەو وتی:

ئەو قسەیە تەواوە پەنیری نۆی،پەیوەندیەکی نوێە لە گەڵ خۆدی ئەو کەسە.ریچارد وتی:

من وردە وردە تێئەگەم کە مانای ئەم داستانە لەوەی کە من تێگەیشتبووم زۆرترە.من ئەم بیروکەیەم لا باشترە کە, لە جیاتی واز هێنان لە پەیوەندی، باشتر ئەوەیە کە واز لە رەفتارە کۆنەکان بێنین.

دووبارە کردنەوەی رەفتارە هەمیشەیەکان ئەبێتە هۆی تاقی کردنەوەی دووبارە. سەبارەت بە ئیشیش هەمان شتە. لە وانەیە من لە جیاتی گۆڕینی ئیشەکەم باشتر وابێت کە چۆنیەتی ئەنجامی ئیشەکەم بگۆڕم. رەنگە کە ئەگەر تا ئیستا ئەوەم بکردایێ زۆر سەرکەوتوو تر ئەبووم.

ئینجا" بێکی" کە لە شارێکی تردا ئەژیا بەڵام لە بەر کۆبوونەوەکە هاتبوو وتی: هەر وەها کە گوێم لە داستانەکەو و پێشنیاری هاورێان گرتبوو ناچار بووم کە بە خۆم پێبکەنم. من ماوەیەکی زۆر وەکوو (هم) بووم،منجە منجم ئەکرد و لە گۆڕان ئەترسام و ئاگام لەوە نەبوو کە خەڵك چۆن ئەم کارە ئەکەن. بە داخەوە بە بێ ئەوەی کە خۆم ئاگام لی بێت، ئەمەشم فێری منداڵەکانم کرد،

ئیستا کە بیری لێ ئەکەمەو, ئەزانم کە گۆڕان بە راستی ئەتوانیت بەرەو شوێنیکی باشترمان بەرێت، هەر چەندە لە کاتی رووداوەکەیدا, زۆری لێ ئەترسین، کاتێکم بیر ئەکەویتەو کە کۆرەکەم لە پۆلی دووی دۆاناوەندی بوو، و بە هۆی ئیشی هاوسەرەکەم پێویستی کرد کە لە هەریمی ئیلینویز

کۆچ کەین بۆ هەریمی ویرمۆنت.کورەکەم لەبەر ئەوەی ئەبۆایە هاوریەکانی بە جێبیلێیت ناجێگیر بوو ، ئەو مەلەوانێکی کارامە بوو بەلاّم قۆتابخانەکەی لە وێرمۆنت تیپی مەلەی نەبوو، هەر بۆیە حەزی لەم کۆچ کردنە نەبوو,

بەلاّم پاش ماوەیەك زۆر حەزی لە کێوەکانی وێرمونت کرد، دەستی کرد بە یاری خلیسکینە و بوو بە یەکێك لە یاریزانەکانی کۆلیجەکەی،و ئیستا بە ویستی خۆی لە کۆلۆرادۆ ئەژیت, ئەگەر ئەم داستانەی پەنیرم پێشتر ببیستایێ ئەمانتوانی خیزانەکەمان لە فشارێکی زۆری دەروونی نجات بدەم,

جێسیکا وتی:

من ئەم داستانە بۆ خێزانەکەم ئەگێرمەوە، پرسیار لە منالّەکانم ئەکەم کە کامەیانم؟ ئسنیف,ئسکری,(هم) یان(ها)؟ و هەروەها خۆیان کامەن؟ وە سەبارەت بەو شتەی کە هەست ئەکەین پەنیرە کۆنەکەی مالّی ئیمەیە و ئەو شتەی کە ئەکرێت پەنیرە نوێیەکەمان بێت لیدوان بکەین,

ریچارد وتی:

بیرۆکەیەکی باشە،من ئەمەوێت وەکوو (ها) بم و لە گەلێ پەنیرەکە بجولێم و چێژی لێ ببینم

ئەمەوێت ئەم داستانە بۆ ئەو هاوریانەم بگەرێنمەوە کە ئەترسن سۆپا بەجیبهیلّن, وە بۆیان شی ئەکەمەو کە گۆران چ مانایەکی هەیە, پێم وابێ لیدوانی زۆری لە سەر بکەین.

مایکلێ وتی:

ئێمە بەم شێوەیە چاکسازیمان بۆ بازرگانی خۆمان کرد, وە سەبارەت بە

ئەو شتەی کە لە داستانەکە فێر بووین و ئەوەێکە چون ئەتوانین بۆ چاکسازی دۆخەکەمان بە کاری بینین چەند جار قسەمان لە سەر کرد,

ئەو لیدوانانە زۆر باش بوو, لە بەر ئەوەی زمانێکمان بە دەست هێنابوو کە بە شێوازیکی باش ئەمانتوانی سەبارەت بە چۆنیەتی رووبەروو بوونەوە لە گەڵ گۆرانەکاندا قسە بکەین،کە ئەمە زۆر کاریگەر بوو، بە تایبەت کاتێك کە ئەم بابەتە زۆر بە گۆڕتر پەرەی سەند.

ناتان پرسی:

مەبەستت لە وشەی بە گۆڕتر چیە؟

مایکلٚ وەلآمی دایەوە :

سەیرکە: هەرچەند کە زۆرتر ئەچوینە قوولآیی کارەکەو،کەسانی زۆرترمان دەست ئەکەوت کە هەستیان ئەکرد توانای کەمتریان هەیە، ئەمانە بە شیوەیەکی زۆر بەر چاو لە گۆڕانیك کە ڕێتێئەچوو کە لە سەرەوە بە سەریان دا بسلمێنرێت ئەترسان, هەر بۆیە بەرامبەر بە گۆڕان بەرهەڵستیان ئەکرد.

بە کۆرتیەکەی گۆڕانیك کە بسەلمینریت،ناکۆکی لێ ئەکەویتەوە,

بەلآم کاتیك کە داستانی پەنیر بە بێ کەم وزیاد لە گەڵ هەموو باس کرا یارمەتی داین کە دیدگامان سەبارەت بە گۆڕانکاری، بگۆڕین. ئەمە یارمەتی هەمووی داین کە پێبکەنین. یا بە لایەنی کەمەو بە ترسە کۆنەکانیان پێبکەنن و بەردەوام بن لە جووڵە کردن.

هەروەها مایکلٚ وتی:

خۆزگە ئەم داستانەم زووتر ببیستایە,

کارلۆس پرسی:

بۆ؟

مایکڵ وەڵامی دایەوە:

لە بەر ئەوەیٚ ئیمە ئەوەندە درەنگ هەستمان کرد کە پێویستمان بە گۆڕانە کە ئیدی دەرامەتمان بە شێوەیەکی بەر چاو شکستی هینابوو. هەر بۆیە ناچار بووین کە هەندێك لە کارمەندەکانمان دەر کەین، هەر وەها کە پێشتر ئاماژەم پێدا هەندێکیان هاورێی خۆشەویستمان بوون.

ئەمە بۆ هەموو لایەکمان قۆرس بوو. بە هەر حاڵ چ ئەوانەی مانەوە وە چ زۆربەی ئەوانەی کە رۆیشتن وتیان کە داستانی پەنیر یارمەتی داون کە بە شێوازێکی دیکە سەیری بارودۆخەکە بکەن،

ئەوانەی کە ناچار بوون کە برۆن و بە دوای کاری نوێدا بگەرێین،وتیان کە .ئاشنا بوون بە بارودۆخی نوییان بە لاوە قورس بووە، بەڵام بەبیر هینانەوەی ئەو داستانە یارمەتی داون.

ئانجێلا پرسی:

چ شتێك زۆرتر یارمەتی دەریان بوو؟

مایکڵ وەڵامی دایەوە :

پیاَن وتم دوای ئەوەی کە بە سەر ترسەکەیان دا زاڵ بوون، باشترین شت پەیبردن بەم خاڵەیە کە پەنیرێکی نوی لە دەرەوەیٚ ئێرە چاوەڕانیانە, وتیان ئەندێشەی وینەیەك لە پەنیری نۆی و سەرکەوتنیان لە ئیشێکی نۆی, هەستێکی باشی تووش کردوون و یارمەتی داوٚن کە لە لیدۆاندا, سەبارەت بە ئیشەکەیاَن سەرکەوتووتر بن. زۆربەیان ئیشی باشتریان

دەست کەوت،

لۆرا پرسی:

ئەی ئەوانەی کە لە کۆمپانیا مانەوە چی؟

مایکڵ وتی :

لە جیاتی بۆڵەبۆڵ کردن لە گۆڕانکاریەکان، وتیان کە تەنها پەنیرەکەیان جێبەجێ بووە و دەستیان کرد بە گەڕان بە دوای پەنیری نوێدا کە هەم بووە هۆی بە فیڕۆ نەدانی کات و هەم فشاری دەروونیانی کەم کردووەتەوە.

زۆری نەخایاند کە ئەو کەسانەی کە دژ بە پرۆژەکە بوون، کە ئەنجامی گۆڕانکاریەکانیان بینی، ئەوانیش لە بەدی هێنانی گۆڕانکاریەکان بەشداریان کرد.

کوری وتی:

بە رای تو بۆ ئەمانە گۆڕان؟

مایکڵ وتی:

دۆای ئەوەی کە فشاری کارمەندەکان لە سەر یەکتر گۆڕا ئاڵوگۆڕیان بە سەر هات. ئینجاپرسی:

لە زۆربەی ئەو شوێنانەی کە ئیشتان کردووە،کاتێك گۆڕان لە لایەن بەرپرسەکانەو ڕاگەینریت چی روو ئەدات؟ ئایا زۆربەی کارمەندەکان ئەڵێن بیرۆکەیەکی باشە؟ یان ئەڵێن خراپە؟

فرانك وەڵامی دایەوە:

ئەڵێن خراپە

---

ئەبوایە بڕۆیشتنایە، کاتی ڕۆیشتن دووبارە سپاسی مایکڵیان کرد،

ئەو لە وەڵام دا وتی:

لە بەر ئەوەی کە ئەم داستانەتان تا ئەم ڕادەیە سوودمەند زانیوە زۆر خۆشحاڵم و هیوادارم ئەم هەلە پەیدا بکەن بۆ کەسانیکەو بۆیان باس بکرێت................

**کێ پەنیرەکەی دەسکاری کردم**.......